(١)

(ڕۆمان)

# مەرگی ئیڤان ئیلیچ

لیۆن تۆلستۆی

وەرگێڕانی

ئەمین گەردیگلانی



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- مەرگی ئیڤان ئیلیچ
- **نووسینی:** لیۆن تۆلستۆی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **پیتچنین:** محەمەد ئەمین شاسەنەم
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **ژمارەی سپاردن:** ٦٧١ لە ساڵی ٢٠١١ دراوەتێ
- **نرخ:** ٢٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١١
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی ڕۆژهەڵات (هەولێر)**

زنجیرەی کتێب (٥٧٦)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**پێشەکی:**

کۆنت لئۆنیکۆلاڤیچ تۆلستۆی (-) یەکێک لە نووسەرە گەورەکانی دنیایە و هەروەها یەکێک لە بلیمەتەکانی جیهانی ئەدەب دێتە ئەژمار. تۆلستۆی لە ماوەی  ساڵ تەمەنی خۆیدا شایەدی پڕگۆڕانکاریترین سەدەکان و دەورەکانی مێژووی وڵاتی خۆی بوو، ئەو جگە لەوەی نووسەرێکی مەزن بوو، فەیلەسووف و ڕێبەرێکی کۆمەڵایەتیش بوو کە هاوچەرخەکانی لە هەمبەریدا سەری ڕێزیان دادەنەواند.

تۆلستۆی لە ماوەی ژیانیدا حوکوومەتی چوار تێزاری دی و ئەو لە ناوبانگ و گەورەییدا هاوشانی تێزاری کاتی خۆی دەهاتە ئەژمار. تۆلستۆی لە چینی ئەشرافی کۆمەڵگا بوو بەڵام زۆری پێنەچوو کە بۆی دەرکەوت ژیانی ئەوان هیچ و بێهوودەیە و بە تەواوی ڕووی لێوەرگێڕا. ئەو بە وەدەست هێنانی ئەزموونی جۆراوجۆر و ناسینی هەوراز و نشێوەکانی ژیان، بەو ئاکامە گەیشت کە ماڵ و سامان و دەسەڵات و ناوبانگ هیچ پێوەندییەکی بە هێمنایەتییەوە نییە و ئۆقرە و ئۆخژنی ڕۆحیی لێناکەوێتەوە. تۆلستۆی لە تەمەنی پەنجا ساڵییەوە ڕووی لە بیر و باوەڕی ئایینی کرد و ئەم پەسڵانە دەروونییە لەوە بەدواوە لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگیدایەوە و بەرەو عیرفان و ماناخوازی کێشرا. تۆلستۆی دوای ئەوە توانیی ژیانی مەجازی لە ژیانی هەقیقی جیا کاتەوە و بیر و باوەڕەکەی سەردەمێک زۆربەی کۆمەڵگای ڕووسیا و پاشان ئاسیا و بەتایبەت چین و هێندوستانی گرتەوە و لە



ڕاستیدا ئەو بانگەشە کردنە بۆ چاکە و برایەتی و خۆشەویستی و چاکەکاری، با چکۆڵە و بەرچاویش نەبن بەڵام بوو بە دەرووی هیوایەک بۆ خەڵکی هەژار و لێقەوماو.

تۆلستۆی ژیانی مەجازی بە ژیانێکی ئاسایی و تێکەڵ بە گێرەوکێشەی ڕۆژانە دەزانێ و ژیانی هەقیقی بە ژیانێکی ئەوپەڕی ماک دادەنێ و لە مرۆڤدۆستی و جوانی پەرەستیدا لێیدەگەڕێ. تۆلستۆی کە ماوەیەکی زۆر بە دوای ژیانی ڕاستەقینەدا وێڵ و سەرگەردان بوو، ژیانی هەقیقیی لە نێو خەڵکانی خوارووی کۆمەڵگادا دۆزییەوە. ئەو خەڵکە بەبێ هیچ چاوەڕوانی و خۆڕانانێک، زۆربەی کاتەکانی ڕۆژ و شەو کاریان دەکرد و دەبوونە هۆی ژیانێکی باش و ئاسان بۆ هاوڕەگەزەکانیان. تۆلستۆی بەرەولای ئەو پاکی و بێفڕوفێڵی و یەکڕەنگییەی ئەوان کێشرا و بوو بە هۆگر و پارێزەری ڕاستەقینەی ئەوان. شێوەی ژیانی ئەوان زۆری سەرنجی تۆلستۆی ڕاکێشا و لە ناخی دڵەوە ڕێزی بۆ دادەنان و ئەو چینەش چونکە زۆرینەی کۆمەڵگا بوون و ڕاستی و پاکیی ئەویان بۆ دەرکەوت، بوونە لایەنگری خۆی و هونەر و بیر و باوەڕەکەی.

تۆلستۆی دەڵێ جیهانبینی زاڵ بەسەر هەر کۆمەڵگایەکدا بایەخەکان وەدیار دەخات و ئەم بایەخانەش ئاگادارانە یان نائاگادارانە شوێن لەسەر ژیانی دەرەکی و ناوەکیی مرۆڤ دادەنێن. پاشان وەکوو خووخدەیان لێدێ و دەبنە نوێنەری فەرهەنگی چینێکی کۆمەڵگا. لە تەواوی نووسراوەکانی تۆلستۆیدا ڕەنگدانەوەی نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بۆ گەشەکردنی کەسایەتیی خەڵک لەبەرچاو گیراوە.

له ئاکامدا ڕازی‌بوون و ناڕەزایەتییەکان و شێوەی ژیانی خەڵک دەبنە ڕەنگدانەوەی سەرەکیی ئەم بنەمایە.

تۆلستۆی هەر لە کتێبە بەناوبانگەکەی (شەڕ و ئاشتی)یەوە بگرە هەتا دەگاتە کورتە چیرۆکەکانی، بە سەداقەت و شارەزاییەکی زۆرەوە لایەنە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆی وەک شەڕ لەگەڵ "ناپلئۆن" () و شەڕی "سپاستۆڤیل" و ژیانی ئەشراف و گەندەڵی ماڵی و ئەخلاقی و چینی هەژار و کۆمەڵگای سەردەمی خۆی هێناوەتە سەر کاغەز و مرۆڤ بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی پێی‌وایە خۆی لە شوێنی ڕووداوەکەیە یان یەکێکە لە کەسایەتیی ڕۆمان و چیرۆکەکانی.

تۆلستۆی زۆری گرنگی بە باری ڕەخنەی کۆمەڵایەتی داوە و بێ‌باکانە بیروڕای خۆی دەربڕیوە و ئاوڕی لە مەسەلە و کێشە گرینگەکانی کۆمەڵگا داوەتەوە، ئەو بەربەرەکانێی لەگەڵ فەساد و داوێن‌پیسی و ترس و مەرگ و ستەم کردووە و دژ بە یاسا بۆگەن و چەق‌بەستووەکانی کۆمەڵگا ڕاوەستاوە و بۆ برەوپێدانی جوانی و هیوا و ئیمان و گەشبینی کە پێی‌وابووە هۆی هێمنایەتی و ئۆخژنی ڕۆحییە، هەوڵی داوە.

نامە و وتەی نووسەرانی گەورەی جیهانی وەک (ئاناتۆل‌فرانس) و (تۆماس‌مان) و (ڕۆمەن ڕۆلان) و زۆری‌تر سەبارەت بە تۆلستۆی باشترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی گەورەیی و بلیمەت‌بوونی تۆلستۆیمان بۆ دەرکەوێ.



ئەم بەرهەمەی دەکەوێتە بەر دیدەی ئێوەی هێژا ئەگەرچی ئێستا سەد ساڵ دوای مەرگی ئەو نووسەر و فەیلەسووفەی جیهانە، نیشاندەری ئەوەشە بەرهەمەکانی ئەو کەڵەنووسەرە بێ‌گومان بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ گەورەییی پێگەی ئەدەبی و بەرزیی ڕۆحە مەزنەکەی.

پیسێمسکی[1] یەکێک لە ڕەخنەگر و نووسەرە گەورەکانی سەردەمی خۆی کاتێک یەکەم بەرهەمی تۆلستۆی دەخوێنێتەوە دەڵێ: (شکی تێدا نییە ئەم ئەفسەرە لاوە دەبێتە نووسەرێک کە دەندووک لە هەموومان دەدات و وەپێش هەموومان دەکەوێ.) کە هەرواش بوو.

بۆ گەورەیی و گرنگایەتیی پلە و پایەی بەرزی تۆلستۆی تەنیا ئەم ڕستەیە ڕەنگە بەس بێ کە ماکسیم گورکی گوتوویەتی: «تۆلستۆی یانی دنیایەکی کامڵ و بێ‌کەموکووڕی.»

لە ڕۆمانی (مەرگی ئیڤان‌ئیلیچ)دا (٦) فەرهەنگی زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا، ئیڤان وا لێدەکا بەرەو بوارێکی دیاریکراو و چارەنوسێکی تاڵ بکێشرێ. ئەو بە شێوەی هێما لە چینێکی ساماندار هەڵبژێرداروە و چۆنیەتیی ژیان و مەرگی ئەو وێنا کراوە. ژیانی ئێڤان ئاسایی‌ترین و ساکارترین و لە ئاکامدا ترسناک‌ترین شێوەی ژیانە و ئەم چەشنە ژیانە کەوتۆتە بەر تیخی ڕەخنەی تۆلستۆی. تۆلستۆی ژیانێک کە بە پێی خووخدە و چاولێکەریی کوێرانە ڕەچاو کرابێ بە هۆکاری ڕەنج و ترس و ئازار دەزانێ.

1 Pisemsky

تۆلستۆی، ئیڤان و گراسیم وەک دوو نموونەی مرۆڤ لە دوو چینی جیاواز هەڵدەبژێرێ و فەرهەنگ و کەسایەتیی ئەوان دەداتە بەر نەشتەری قەڵەم. گراسیم و شێوەی ژیانی وەک کەسێکی زەحمەتکێش، بە فەرهەنگی ژیانێکی ساکارانەوە، لەگەڵ ئەربابە قۆڕەدەماخ و دەمارزلەکان هەڵدەسەنگێنێ. تۆلستۆی لێرەدا هیوادارە بتوانێ ڕاستییەک بێنێتە ئاراوە کە ژیان بۆ هاوڕەگەزەکانی خۆی لە ڕێگای ماناخوازییەوە ئاسان بکاتەوە.

هەروەها (دیلی قەفقاز، ) یەکێکیتر لە بەرهەمەکانی تۆلستۆیە کە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش باس لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ دەکا. هەروەها ئاماژە بە وزەیەکی مەزن دەکات کە چۆن ئەفسەرێکی ڕووسی لە هەمبەر ئازار و ئەشکەنجە و سەختییەکاندا خۆڕاگریی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا قەڵەمی بەبڕشتی ئەم نووسەرە مەزنە سەلماندوویەتی کە هیچ وزەیەک ناتوانێ لەسەر ڕێگای گەیشتن بە ئامانج و هیواکانی مرۆڤ ببێتە کۆسپ و لەمپەر.

ڕۆمانی (باوەسرگی) چیرۆکێکی بە هێز و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕۆحی و وردبینانەیە. ئەو ڕۆمانە هەست و ڕۆحی ڕاستەقینەی مرۆڤێک نیشان دەدات کە ئامادەیە زۆرترین ئازار بەخۆی بگەیێنێ و خۆی بخاتە تاڵترین و دژوارترین بارودۆخی ژیانەوە بۆ ئەوەی ڕواڵەتێکی درۆیینە لە خۆی نیشان بدات و وا بنوێنێ کە مرۆڤێکی مەزن و لە خودا ترسە.

ڕۆمانی (ئەرباب و نۆکەر)یش ئاوێنەی ژیانێکە کە مرۆڤ لەوێدا بۆ سامان و ماڵی دنیا و ململانێی گەیشتن بە دەوڵەمەندی پشت لە



هەموو شتێک دەکات و تەنانەت سەر و گیانی خۆی و دەوروبەرییەکانیشی دەکاتە پلیکانێک کە بەرەو قەڵای سامان و ناوبانگی دەوڵەمەندی پێی سەرکەوێ. هەروەها لەپاڵ ئەویشدا کەسایەتییەکی وەک نیکیتا نیشان دەدا کە بە پێچەوانەی ئەربابەکەی نەک هەر سامان و ماڵی دنیا بە پووشێک نازانێ، بەڵکوو ژیانیشی بەلاوە پووچ و بێنرخە و لە ژیاندا هیچ شتێک تەنانەت ژنەکەشی هی خۆی نییە.

ئەم چوار کتێبە بەبۆنەی سەدەمین ساڵوەگەڕی مەرگی لیۆن تۆلستۆی ئەو نووسەرە مەزنە، وەرگێڕمەوە و پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکەم. بەو هیوایەی توانیبێتم وەرگێڕانێکی باش و جێگای متمانە بخەمە بەردەستی خوێنەران و لایەنگرانی قەڵەمی تۆلستۆی.

// بۆکان

ئەمین گەردیگلانی

## (١)

له دادگای گەورەی شار کاتی پشوودانی کەیسی دادگاییکردنی ملڤینسکی[1]، کاتێک ئەندامانی دادگا و دادستان لە نووسینگەی کاری ئیڤان ئیگۆرۆڤیچ شەبەک[2] لە دەوری یەک کۆ بووبوونەوە، باس هاتەسەر پەروەندەی بەناوبانگی کراسۆڤسکی[3]. فیدۆر ڤاسیلییەڤیچ[4] لەسەر ئەو باوەڕە سوور بوو کە ئیشکردن لەسەر ئەو پەروەندەیە لە توانای ئەواندا نییە، بەڵام ئیڤان ئیگۆرۆڤیچ بیرو ڕای بە پێچەوانەی ئەو بوو. پیتێر ئیڤانۆڤیچ[5] کە لە سەرەتاوە خۆی لە باسەکە وەرنەدابوو، هەروا کە بێدەنگ دانیشتبوو چاوی لە ڕۆژنامەیەک دەکرد کە تازە چاپ کرابوو، لەناکاو گوتی: «برادەران ئیڤان ئیلیچ کۆچی دوایی کرد.»

«گوتت چی!»

پیتر ئیڤانۆڤیچ وڵامی دایەوە: «وەرن خۆتان بیخوێننەوە.»

ڕۆژنامەکە کە هێشتا جەوهەرەکەی شێدار بوو دایەدەست فیدۆر ڤاسیلییەڤیچ. لە ڕۆژنامەکەدا لە نێو چوارچێوەیەکی ڕەشدا ئەم وشانە وەبەرچاو دەکەوت: «پراسکۆڤیا فێدۆرۆڤنا گۆلۆڤینا[6] بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە کۆچی دوایی مێردی خۆشەویستی خۆی

1 Melvinski
2 Ivan Egorovich shebek
3 Krasovski
4 Fedor Vasilievich
5 Peter Ivanovich
6 Praskovya Fedorovna Golovina



ئیڤانئیلیچ گۆلۆڤین[1]، یەکێ لە ئەندامانی دادگا، لە ڕۆژی چوارەمی فیوریەی دا بە ئاگاداریی خزمان و ئاشنایان ڕادەگەیێنێ. ڕێوڕەسمی ناشتن سەعات یەکی دوانیوەڕۆی هەینی بەڕێوە دەچێ.»

ئیڤان هاوکاری دانیشتووانی کۆڕەکە بوو و زۆریان خۆشدەویست. چەند حەوتوو بوو نەخۆش بوو و گوتبوویان نەخۆشییەکەی ماریجەی نایە. هەڵبەت پلەی ئیدارییەکەی پارێزرابوو، بەڵام وێدەچوو دوای مەرگی ئەو ئالکسیڤ[2] جێگای بگرێتەوە و ڤینیکۆڤ[3] یان شتابێل[4] ببنە جێگری ئالکسیڤ. بۆیە ئەو کەسانەی لە کۆڕەکەدا بوون هەرکام لە زەینی خۆیاندا بیریان لەلای گۆڕان و چوونەسەری پلە و پایەکان بوو کە لەگەڵ هەواڵی مەرگی ئیڤان وێدەچوو بەر ئەوان بکەوێ.

فێدرۆر ڤاسیلییەڤیچ بیری کردەوە: «دەبێ دڵنیا بم کە جێگای شتابێل یان ڤینیکۆڤ دەگرمەوە. لەمێژە بەڵێنی ئەوەیان بە من داوە و ئەو چوونەسەری پلەوپایەش یانی ساڵانە بڕی هەشتسەد ڕوبل و هەروەها پاداشی بۆنە و کاروبارەکان.»

پیتێر ئیڤانۆڤیچ بیری کردەوە: «ئێستا دەبێ بۆ ڕاگوێستنی ژنبراکەم لە کالووگا[5] دەستبەکار بم. هاوسەرەکەشم زۆری پێخوش

1 Ivan Ilych Golovin
2 Alexeev
3 Vinnikov
4 shtabel
5 Kaluga

دەبێ و ئیتر ناتوانێ سەرکۆنەم بکات کە هیچکات نەمتوانیوە کارێک بۆ خزمو کەسەکانی بکەم.»

پیتێر ئیڤانۆڤیچ گوتی:

– من دەمزانی ئیتر چاک نابێتەوە و مردنەکەی یەکجارییە. بەداخەوە.

– بەڕاستی نەخۆشییەکەی چیبوو؟

– پزیشکەکان تێی‌نەگەیشتن، هەرکامەیان شتێکیان دەگوت و تەشخیسەکانیان جۆراوجۆر بوو. دواییین‌جار کە چاوم پێی‌کەوت پێم‌وابوو حاڵی باشە و چاک دەبێتەوە. – بەڵام من لە ڕۆژانی پشووی جێژنەوە نەچوومە سەردانی و هەمیشە لە بیری ئەوەدا بووم بچم بەڵام ئەو هەلەم بۆ نەڕەخسا.

– بارودۆخی ماڵییەکەی چۆن بوو؟

– پێم‌وایە ژنەکەی بڕێ ماڵ و سامانی هەیە. بەڵام شتێکی‌وا نییە.

– دەبێ بچین بۆ ڕێوڕەسمی بە خاک سپاردن و سەرەخۆشی، بەڵام ماڵەکەیان زۆر دوورە.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ ڕووی لە شەبەک کرد و دوای ئەوەی بزەیەکی هاتێ گوتی:

– دیتووتە قەت ناتوانێ لە من ببووری چونکە ماڵەکەم لەوبەری ڕووبارەکەیە.

پاشان هەروا کە سەبارەت بە مەودای نێوان شار و شارۆچکەکان دەدوان، گەڕانەوە بۆ کۆڕەکەی دادگا.



جگە لەو بیر و بۆچوونانەی کە سەبارەت بە مەرگی ئیڤان و گۆڕان و هەڵچوونی پلەوپایە ئیدارییەکان فیکر و زینی داگرتبوون، حەقیقەتی مەرگی هاوڕییەکی نزیکیان، وەک هەمیشە هەستی ڕەزایەتی لە ناخی ئەو کەسانەدا دەجووڵاند کە هەواڵەکەیان دەبیست و لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت «ئەو مردووە نەک من!»

هەرکام لەوان بیریان دەکردەوە و هەستیان دەکرد «زۆر باشە، ئەو مردووە، بەڵام من زیندووم!» ئەو دۆست و هاوڕێیانەی لێی‌نزیکتر بوون، یانی هەڤاڵەکانی، هەستیان دەکرد کە پێویستە لە ڕێوڕەسمی تاڵ و کەسەرباری بە خاک سپاردنەکەیدا بەشداری بکەن و بچن سەرەخۆشی لە هاوسەری هاوڕێکەیان بکەن.

فیدۆرڤاسیلی ڤیچ و پیتێر ئیڤانۆڤیچ لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی ئەو بوون، پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ ئیڤان‌ئیلیچ کۆلیژی مافیان پێکەوە تەواو کردبوو و خۆی بە منەتباری ئەو دەزانی.

کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆ، لەگەڵ ژنەکەی خۆی سەبارەت بە مەرگی ئیڤان‌ئیلیچ و چۆنیەتیی ڕاگوێستنی براکەی بۆ شارەکەی خۆیان دوا. پیتێر ئیڤانۆڤیچ چاوپۆشیی لە سەرخەوی دوانیوەڕۆ کرد، جلوبەرگی فەرمیی لەبەر کرد و بەرەو ماڵی ئیڤان‌ئیلیچ وەڕێ کەوت. لەبەر دەرگای ماڵی ئیڤان‌ئیلیچ فایتوونێک و دوو عارەبانەی یەکئەسپە ڕاوەستابوون. لە سەرسەرای نهۆمی خواروو، نزیک دیوی جلان، دەرگای زێڕ کفتی تابووتێک بە گوڵینگ و مەنگۆڵەوە هەڵپەسێردرابوو، تەختە تیفتیفە دراوەکەی لە دوورەوە بریقەی دەهات. هەر لەوکاتەدا دوو خاتوونی ڕەشپۆش خەریکبوون باڵتە

کەلپۆسەکانی خۆیان دادەکەند. پیتێر ئیڤانۆڤیچ یەکێکیانی دەناسی کە خوشکی ئیڤان‌ئیلیچ بوو، بەڵام ئەوی دیکەیان بۆ ئەو دیوناس نەبوو. شوارتێز[1] هاوکاری پیتێر ئیڤانۆڤیچ هات بۆ نهۆمی خواروو، بەڵام کە چاوی بە پیتێر ئیڤانۆڤیچ کەوت لە جێی خۆی ڕاوەستا و چاوێکی لێ‌قرتاند. دەتگوت دەیهەوێ بڵێ: «ئیڤان‌ئیلیچ بارودۆخەکەی بەجارێ تێکداوە و بیری لە حاڵی ئێمە نەکردۆتەوە.»

ڕوخساری شوارتێز و سمێڵی پیکادلیانە و قەڵافەتی کز و لاوازی بەو جلوبەرگە فەرمییەوە، وەک هەمیشە قوڕساخی و سەنگینی پێوە دیاربوو، بەڵام لێرەدا زۆر لەگەڵ کەسایەتیی قەشمەر و جەفەنگبازی ئەو جیاواز بوو یان لەبەر چاوی ئیڤان‌ئیلیچ وای دەنواند.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ بە ڕێزەوە خۆی لادا تاکوو ژنەکان وەپێشی بکەون و خۆی لەسەرەخۆ بە دوای ئەواندا وەسەر کەوت. شوارتێز لە پلیکانەکان نەهاتە خوارێ و هەر لە جێی خۆی ڕاوەستا. پیتێر ئیڤانۆڤیچ تێگەیشت کە ئەو دەیهەوێ شوێنی قوماری شەوێ پەیدا بکات. ژنەکان چوونە ژووری هاوسەرەکەی ئیڤان‌ئیلیچ و شوارتێز کە بە توندی لێوی بە سەریەکدا نابوو و چاوی قەشمەرانە کسکەی دەهات، بە هەڵتەکاندنی برۆی ئاماژەی بە ژوورێک کرد کە مەیتەکەی لێ ڕاکێشرابوو.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ وەکوو هەموو کەسێکی‌تر لەمجۆرە کاتانەدا کە چووە نێو ژوورەکەوە نەیدەزانی دەبێ چیبکات. تەنیا ئەوەی دەزانی

1 Shwartz



کە لەوکاتانەدا باشترین کار ئەوەیە کە خاچی خۆی بکێشێ. بەڵام بە جوانی نەیدەزانی کە کاتێ خاچی خۆی دەکێشێ دەبێ کڕنۆشیش بەرێ یان نا. بۆیە ئاستی ناوینی هەڵبژارد و کە چووە ژوورێ خاچی خۆی کێشا و بە ئاستەم خۆی دانەواند وەک ئەوەی کڕنۆش بەرێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ئەوجێیەی جووڵانی دەست و سەری ودمی پێدا چاوی بە ئامادەبووواندا گێڕا.

دوو کوڕی لاو کە ڕواڵەتەن برازای کۆچکردووەکە بوون و یەکێکیان قوتابیی قۆناخی دواناوەندیی ویژە بوو، لەگەڵ ئەوەی خاچی خۆیان دەکێشا لە ژوورەکە چوونە دەرێ. پیرێژنێک بێ‌جووڵە ڕاوەستابوو و ژنێکی‌تر کە برۆکانی بە شێوەیەکی زۆر سەیر کەوانی بوون خەریکبوو دەیچرپاند بە گوێیدا. قەشەیەکی تێکسمڕاو و لێبڕاو بە جلوبەرگێکی تایبەتەوە بە دەنگی بەرز دۆعای خوێند، بە شێوەیەک کە دەنگی بەسەر شوێنەکەدا زاڵ بوو. گراسیم، خزمەتکاری ئیڤان‌ئیلیچ، بە هێوری بە بەردەمی پیتێر ئیڤانۆڤیچدا تێپەڕی و شتێکی لە عەرزەکە پڕژاند. پیتێر ئیڤانۆڤیچ کە ئەوەی دی لەڕێوە بۆنێکی کەمی هەست پێکرد کە تێگەیشت مەیتەکەیە خەریکە بۆن دەگرێ. پیتێر ئیڤانۆڤیچ، لە دوایین سەردانیدا بۆلای ئیڤان‌ئیلیچ لە ژووری متاڵاکردنەکەی چاوی بە کراسیم کەوتبوو. ئیڤان‌ئیلیچ هۆگرییەکی تایبەتی بە گراسیم هەبوو. ئەو وەک پەرستارێک خزمەتی بە ئیڤان‌ئیلیچ دەکرد. پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ ئەوەی سەری لە ئالیی نێوان تابووتەکە و قەشە و وێنەی پیرۆزی سووچی ژوورەکە خوار کردبۆوە، خەریکبوو خاچی خۆی دەکێشا. لە ئاکامدا هەستی کرد

خاچکێشانەکەی زۆری خایاندووە، بۆیە بێجووڵە ڕاوەستا و چاوی لە تەرمەکە بڕی.

مردوو، وەکوو هەموو مردوویەکیتر، بە قورسییەکی تایبەتەوە ڕاکێشرابوو. دەست و لاقە ڕەقەڵەکانی لە نێو بالیفە نەرمەکانی نێو تابووتەکە هەڵچەقیبوون و سەری بۆ هەمیشە لەسەر باڵنجەکەدا خوار بووبۆوە. ناوچاوانە ڕەنگبزرکاوەکەی بە گولدوزامەکانی لاجانگییەوە کە تێکقووپا بوون، شێوەی ڕەنگی مردووی لەخۆ گرتبوو و دەتگوت لووتە قیتەکەی لەسەر لێوی سەرووی قورسایی دەکا. ئەو زۆر گۆڕابوو و تەنانەت زۆر لاوازتر لەو دوایینجارە بوو کە پیتێر ئیڤانۆڤیچ چاوی پێیکەوتبوو.

بەڵام هەروەک چۆن مەرگ هەمیشە حاڵەتێکی تایبەتی هەیە، ڕوخساری ئیڤانئیلیچ جوانتر و قورساختر لە کاتی زیندووبوونی دەهاتە بەرچاو. ڕوخساری وایدەنواند کە ئەوەی پێویست بووە ئەنجامی داوە و زۆر بە باشیش ئەنجامی داوە. جگە لەوەش دەموچاوی حاڵەتێکی وریایی پێدان و سەرکۆنەی بۆ زیندووەکان پێوەبوو. ئەو وریایی پێدانە بۆ پیتێر ئیڤانۆڤیچ نابەجێی دەنواند، هەستی بە دڵتەنگی کرد و خاچێکی خۆی کێشا و زۆر بە هەڵەپڕووکێ و بێ لەبەرچاوگرتنی دابو نەریت بە شێوەیەک کە خۆی ئاگای لە کردەوەی نائاساییی خۆی نەبوو، لە ژوورەکە چووە دەرێ.

لە ژووری ڕووبەروو، شوارتێز لەگەڵ ئەوەی لاقی لێکبڵاو کردبوو و بە کڵاوەکەی خۆی یاریی دەکرد چاوەڕوانی ئەو بوو. پیتێر



ئیڤانۆڤیچ کە چاوی بە حاڵەتی قەشمەریانە و ڕازاوە و قورسساخی شوارتێز کەوت، هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا و هەستیکرد شوارتێز تەسلیمی خەم و دڵتەنگییەکان نابێ. ڕوانینی شوارتێز دەیگوت کە ڕێوەڕەسمی بەخاکسپاردنی ئیڤانئیلیچ هۆکارێک نییە بۆ پەکخستنی یاریی پاپەزێن. هەر لەوکاتەدا خزمەتکارەکە چوار مۆمی تازەی هێنا و لەسەر مێزەکە داینا. لە ڕاستیدا هیچ هۆیەک نەبوو کە ئەم ڕووداوە ببێتە کۆسپێک لەسەر ڕێگایان و نەهێڵێ دوانیوەڕۆیەکی شادیان هەبێت و خۆشی ڕابوێرن. کاتێک پیتێر ئیڤانۆڤیچ لە بەردەمی شوارتێزەوە تێپەڕی، شوارتێز ڕاست ئەوەی بە سرتە دەربڕی و حاڵیی کرد کە یاریی پاپەزێن لە ماڵی فیدۆر ڤاسیلییەڤیچ بەڕێوە دەچێ. بەڵام وێدەچوو پیتێر ئیڤانۆڤیچ حەزی لەو یارییە نەبێ و نەیهەوێ بچێ.

پراسکۆڤیا فیدرۆڤنا کە ژنێکی کورتەباڵای قەڵەو بوو ئەگەرچی زۆری هەوڵ دەدا و ئیشی زۆر بوو بەڵام هەروا گۆشتن و پانوپۆڕ بوو، برۆ لەڕادەبەدەر کەوانییەکەشی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. ئەو سەرتاپا ڕەشپۆش بوو، لەگەڵ چەند ژنی دیکە لە ژوورەکەی خۆی هاتە دەرێ و ئەوانی بۆ ئەو ژوورە ڕێنوێنی کرد کە تەرمەکەی لێبوو، گوتی:

– تکایە فەرموون، دوای چەند خولەکیتر ڕێوڕەسمی ناشتن دەستپێدەکات.

شـوارتێز بـەحـاڵ کرنۆشـێکی کـرد و لـە جێـی خـۆی بـێجووڵـە ڕاوەستا. دیاریش نەبوو کە ئەو داواکارییەکەی ئەو خاتوونـەی بـەدڵـە یان نا.

پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا، پیتێر ئیڤانۆڤیچی ناسییەوە. هـەناسـەیـەکی هەڵکێشا و ڕۆیشت بۆلای، دەستی گرت و گوتی:

– دەزانم تۆ هاوڕێی ڕاستەقینەی ئیڤان‌ئیلیچ بووی...»

چاوەڕوانی وەڵامێکی شیاو بوو بۆیە چاوی لە چاوی کرد. بەڵام پیتێر ئیڤانۆڤیچ دەیزانی کە لە ژووری تەرمەکە خاچکێشان باشترین کارە، بۆیە خێرا خاچی خۆی کێشا. پاشان دەستی ئەوی گوشی و لەگەڵ ئەوەی هەناسەیەکی هەڵکێشا گوتی:

– هەر یارمەتییەکم لەدەست بێ دریغی ناکەم...

پیتێر ئیڤانۆڤیچ دوای ئەو کارانە هەستی کرد کە هاتن و بەشداری کردنەکەی لەو ڕێوڕەسمەدا بەجێ بووە: چونکە هەم خۆی دڵی پڕبوو هەم ژنەکەی ئیڤان‌ئیلیچی کۆچکردوو.

ژنەکەی ئیڤان‌ئیلیچ گوتی:

– تکایە لەگەڵ من وەرە. بەر لە دەستپێکردنی ڕێوڕەسمەکە دەمەوێ قسەتان لەگەڵ بکەم. دەستت بدە دەستم.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ قۆڵی کردە قۆڵی ژنە و پێکەوە بەبەردەمی شوارتێزدا تێپەڕین و پێکەو چوون بۆ ژوورەکانی ناوەوە. شوارتێز چاوێکی لە پیتێر ئیڤانۆڤیچ داگرت و ڕوانینە قەشمەرییەکەی گوتی: «یاریی پاپەزێنەکەمان جێبەجێ بوو. ئەگەر کەسێک پەیدا بوو یاری بکات تۆ ئیتر دژایەتی مەکە و ئەگەر ڕێگای دەربازبوونت بۆ



هەڵکەوت زوو وەرە بۆلامان. پیتێر ئیڤانۆڤیچ بە دڵتەنگییەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا باسکی گوشی و پێکەوە چوونە ژووری میوانداری کە بە پەردەی پەمەیی ڕازابۆوە و بە چرایەکی کەمشۆق ڕووناک بووبۆوە. پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا لەسەر مۆبل و پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەسەر کورسیلەیەکی کە فەنەرەکانی ترازا بوون دانیشتن. پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا دەیویست پێی‌بڵێ لە جێیەکی‌تر دانیشێ، بەڵام ئەو وریایی پێدانەی لەگەڵ بارودۆخەکە بە باش نەزانی و هیچی نەگوت.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەسەر کورسیلەکە دانیشت و وەبیری هاتەوە کە چۆن ئیڤان‌ئیلیچ ئەم ژوورەی ڕازاندبۆوە و بۆ پەردە پەمەییەکانی بە گەڵای سەوزەوە تەگبیری لەگەڵ ئەم کردبوو.

ژوورەکە پڕبوو لە کەلوپەلی بەڕواڵەت گرانبایی. پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا ڕۆیشت بۆلای قەنەفەکە و پەراوێزی دەسماڵە ڕەشەکەی لە لێواری برگەبرگەی مێزەکە گیرا و پیتێر ئیڤانۆڤیچ وزاقی لە خۆیدا هەستێ و فەنەرە ترازاوەکانی کورسیلەکە دەستیان‌کرد بە جیرەجیر خەریکبوو لەبەریەک بڵاو بن. ژنە خۆی ویستی لکەی دەسماڵەکەی لێبکاتەوە و پیتێر ئیڤانۆڤیچ لە جێی خۆی دانیشتەوە و فەنەرە دەرچووەکان دیسان بە جیرەجیر چوونەوە، پاڵیەک. بەڵام ژنە نەیتوانی لێی‌بکاتەوە و پیتێر ئیڤانۆڤیچ دیسان هەستا و فەنەرە ترازاوەکان دیسان دەرپەڕینەوە و تەقوکوتیان لێ‌هەستا. ئەو وێستانەی کە بە هۆی گیرکردنی لەچکەکە و دەرپەڕینی فەنەرەکانەوە هاتەپێشێ، خەم و دڵتەنگییەکەی پیتێر ئیڤانۆڤیچی کەم کردەوە و بە

نیگایەکی گرژ و عەبووسەوە دانیشت. پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا لەچکەکەی لێکردەوە و خۆی ئامادە کرد بۆ گریان و فرمێسک هەڵوەراندن. ئەم بارودۆخە نائارامەش بە هاتنەژووریی سۆکۆلۆڤ[1] خزمەتکاری ئیڤانئیلیچ کۆتایی پێهات. سۆکۆلۆڤ ڕایگەیاند شوێنی ئەو کۆڕەی کە پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا لە قەبرستان هەڵیبژاردووە، نرخەکەی دووسەد ڕۆبڵە. ژنە گریانەکەی ڕاگرت و وەک قوربانییەک چاوی لە پیتێر ئیڤانۆڤیچ کرد و بە زمانی فەرەنسی گوتی کە تووشی بارودۆخێکی زۆر دژوار بووە. پیتێر ئیڤانۆڤیچ وتەکەی ئەوی بەسەر لەقاندنێکی ئارامەوە پشتڕاست کردەوە.

ژنە کە بە هۆی دڵپڕییەوە دەنگی دەلەرزی گوتی:

– تکایە تا تۆ جگەرەیەک دەکێشی من دوو قسە لەگەڵ سۆکۆلۆڤ دەکەم.

پاشان ڕۆیشت بۆلای سۆکۆلۆڤ تاکوو سەبارەت بە قیمەتی گۆڕەکە قسەی لەگەڵ بکات. پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ ئەوەی جگەرەیەکی داگیرساند، وشە بە وشە قسەکانی پراسکۆڤیا فێدرۆڤنای بیست. سەبارەت بە شوێنە جۆراوجۆرەکانی گۆڕستان و کڕینی قەبر. ئاخری بڕیاریدا لە کام پەڵە زەوی گۆڕستانەکە قەبر بکڕێ. دوای ئەو کارە سەبارەت بە ڕێوڕەسمەکانی کلیسا فەرمانی پێدا و سۆکۆلۆڤ لە ژوورەکە چووە دەرێ.

ژنە بە پیتێر ئیڤانۆڤیچی گوت:

1 Sokolov



– هەموو کارەکان لە ئەستۆی خۆمە.

لەگەڵ ئەوەی ئاڵبۆمەکانی سەر مێزەکەی ئەمبارەوبار دەکرد، چاوی بە سووتووی جگەرەکەی پیتێر ئیڤانۆڤیچ کەوت. بەپەلە تەپڵەکێکی لەبەر دەمی داناو گوتی:

– ڕەنگە بە خۆڕانانی بزانی بەڵام دەبێ ئەو ڕاستییە بدرکێنم کە خەمەکە هێندە لەسەر دڵم قورسایی دەکا، بۆتە هۆی ئەوەی نەتوانم بە جوانی بە کاروبارەکان ڕابگەم. ئەگەر شتێکیش هەبێ دڵمی پێئارام ببێتەوە بەپێچەوانە زیاترم خەفەتبار دەکات، بە بڕوای من هەموو شتێک پێوەندی بە ئەوەوە هەیە.

لەگەڵ ئەوەی دڵی پڕبووبوو و خەریکبوو دەستبکات بە گریان جارێکیتر دەستەسڕەکەی دەرهێنا. بەڵام لە ناکاو وەک ئەوەی بەسەر هەستی دڵی خۆیدا زاڵ بووبێ، تەکانێکی لە خۆیدا و بە شێنەیی دەستیکرد بە قسەکردن:

– بەڵام شتێک هەیە کە دەمەوێ لەگەڵ تۆ بیهێنمە گۆڕێ.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ ئەوەی بیری لەلای فەنەری کورسیلەکە بوو کە خەریکبوون دەردەپەڕین، کڕنۆشێکی بۆ کرد.

پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا گوتی: لەم ڕۆژانەی کۆتاییدا بەڕاستی زۆری ئازار کێشا.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ گوتی: زۆری ئازار کێشا؟

– زۆر ناخۆش و تاقەتبڕ بوو، سێ ڕۆژی کۆتایی بەردەوام دینالاند و هاواری دەکرد. ئاراو قارای لێهەڵگیرابوو. بۆخۆشی و بۆ ئێمەش ناخۆش بوو و بەڕاستی تامڵ نەدەکرا. خۆشم نازانم چۆنم

ئەو چەند ڕۆژە تامڵ کرد. سێ ژوور ئەولاوە گوێت لە دەنگی ناڵە و هاواری دەبوو. نازانی چ زەجرێکم کێشا.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ پرسیی: یانی لەو ماوەیەدا هەر هۆشی هەبوو؟

ژنە لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوە: بەڵێ هەتا دوایین هەناسە هۆشی هەبوو. چارەگێک بەرلە مردنەکەی ماڵئاواییی لە ئێمە کرد و داوای لێکردین ڤلۆدیا[1] لە ژوورەکەی بەرینە دەرێ.

هەستپێکردن و هێنانە بەرچاوی ڕەنج و ئازارەکانی هاوڕێییەک کە ئەوی وەک کوڕێژگەیەکی هاپۆلی خۆی و دواتریش وەک هاوکارێکی فەرمانگە دەناسی، لە ناکاو پیتێر ئیڤانۆڤیچی وەخۆ هێنایەوە و ترسی خستە دڵییەوە و هەیبەتی ئیڤانئیلیچی لە نێو تابووتەکەدا وەبیر هاتەوە و ترسی لێنیشت.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ بیری کردەوە: سێ ڕۆژ ڕەنج و ئازارێکی تاقەتبڕ و پاشان مەرگ! بۆ؟ لەوانەیە منیش ئاوا نەخۆش کەوم و تووشی ئەو ئازارە ببم.» بێئیختیار لەبەرخۆیەوە دووپاتی کردەوە: «ئەم دەردە تووشی ئیڤانئیلیچ بووە نەک من، نابێ تووشی منیش بێ. ئەگەر بیر لەوە بکەمەوە تووشی خەمۆکی دەبم، شوارتێز بە ئاشکرا دیارە تووشی خەمۆکی نەبووە.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ هێور بۆوە. وەک ئەوەی مەرگ بۆ ئیڤانئیلیچ شتێکی سروشتی بووبێ نەک بۆ ئەو. پاشان سەبارەت بە چۆنیەتیی مەرگی ئیڤانئیلیچ بە وردی پرسیاری کرد. پیتێر ئیڤانۆڤیچ چۆنیەتیی

1 Vlodya



ژان و ئازارە قورسەکەی ئیڤانئیلیچی لە خەم و دڵتەنگییەکانی هاوسەرەکەیدا هەست پێکرد. پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا ڕواڵەتەن هەستی کرد دەبێ بە کاروبارەکانی ڕابگا، پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

– پیتێر ئیڤانۆڤیچ! زۆر دژوارە، بەڕاستی دڵتەزێنە!

پاشان دەستیکرد بە گریان. پیتێر ئیڤانۆڤیچیش هەناسەیەکی هەڵکێشا و ڕاوەستا هەتا ژنە چاوو لووتی سڕی. پاشان گوتی:

– لە من دڵنیابە و متمانەم پێبکە...

ژنە دیسان دەستیکرەوە بە قسەکردن و ڕاشکاوانە چووەسەر بابەتی سەرەکی. ئەو دەیویست بزانێ بە بۆنەی مەرگی مێردەکەیەوە دەتوانێ چەندە پارە لە دەوڵەت وەرگرێ. بابەتەکەشی جۆرێک درکاند وەک ئەوەی بیهەوێ بیروڕای پیتێر ئیڤانۆڤیچ سەبارەت بە مووچەی خانەنشینی هاوسەرەکەی بپرسێ. بەڵام پیتێر ئیڤانۆڤیچ زۆر زوو تێگەیشت کە ئەو هەموو شتێک و تەنانەت کەمترین وردەکارییەکان دەزانێ، تەنانەت زۆر لەوەش زیاتر کە خۆی دەزانێ. ئەو بە تەواوی لەوە ئاگادار بوو کە دوای مەرگی مێردەکەی بڕی چەندە پارە لە دەوڵەت وەردەگرێ، بەڵام دڵنیا نەبوو کە دەتوانێ بڕێکی زیاتر وەرگرێ یان نا؟

پیتێر ئیڤانۆڤیچ دوای تۆزێ بیر کردنەوە پێیڕاگەیاند کە ناتوانێ پارەی زیاتر وەرگرێ و بۆ دڵخۆشکردنی ئەو دەوڵەتی بە هۆی ڕژدی و چنۆکی سەرکۆنە کرد. پاشان ژنە هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ئاشکرا لە بیری چارەیەکدا بوو تاکوو لە چنگی ئەو میوانە نەجاتی

بێ. پیتێر ئیڤانۆڤیچ لە مەبەستەکەی تێگەیشت، جگەرەکەی کووژاندەوە، دەستی گوشی و ڕۆیشت بۆ ژووری چاوەڕوانی.

لە ژووری چاوەڕوانی کاتژمێرە دیوارییەکەی ئیڤانئیلیچ کە لە ئەنتیکەخانە کڕیبووی هەروا زەمانی نیشان دەدا. پیتێر ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ قەشە و چەند کەسیتر لە خزمان و ئاشنایان کە بۆ بەشداریکردن لە ڕێوڕەسمەکەدا هاتبوون بەرەوڕوو بوو.

کچەکەی ئیڤانئیلیچ کە زۆر جوان و ڕووکراوە بوو، جلە ڕەشەکانی بەری لێبووبوو بە نەخش و بەژن و باڵا زراڤەکەی لە جاران زیاتر لاوازی دەنواند. ڕواڵەتێکی تاڕادەیەک تووڕەی هەبوو و جۆرێک کڕنۆشی بۆ پیتێر ئیڤانۆڤیچ کرد کە دەتگوت سەرکۆنەی دەکات. دەزگیرانی کچەش لەوێ بوو کە کوڕی لێکۆڵەرێکی دادگا بوو، کوڕە لاوێکی جوانچاک و چالاک بوو ـ هەڵبەت پیتێر ئیڤانۆڤیچ ئەوی دەناسی ـ کە بە ڕوخسارێکی زویرەوە لە پشتسەری کچەکە ڕاوەستابوو. پیتێر ئیڤانۆڤیچ خەمبارانە کڕنۆشێکی بۆ هەردووکیان کرد و کاتێک دەیویست بچێ بۆ ژووری تەرمەکە، کوڕە قوتابییەکەی ئیڤانئیلیچ کە لەڕادەبەدەر شێوەی باوکی دەدا، بە پلیکانەکاندا هاتە سەرێ. ئەو شێوە و وێکچوونە زۆرەی ئەو لەگەڵ باوکی، بیرەوەریی سەردەمی خوێندن لە زانکۆی مافی لە داڵغەی پیتێر ئیڤانۆڤیچدا زیندوو دەکردەوە.

لە نێو چاوە فرمێسکاوییەکانیدا سەرنجێکی پڕ لە هاروهاجی شەپۆلی دەدا، ڕوانینێک کە تایبەتی منداڵانی سێزدەچاردە ساڵانە بوو. ئەو کە چاوی بە پیتێر ئیڤانۆڤیچ کەوت بە ڕوویەکی گرژ و



شەرمنانەوە سەری داخست. پیتێر ئیڤانۆڤیچ سەرێکی بۆ لەقاند و ڕۆیشت بۆ ژووری تەرمەکە.

ڕێوڕەسمەکە دەستیپێکرد: مۆم داگیرسان و بۆنی عوود وڵاتی داگرت و دەنگی گریان و شەپۆڕ و فرمێسکهەڵوەراندن دەستیپێکرد.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ ڕاوەستا و خەمبارانە چاوی لەبەر پێی خۆی بڕی. ئەو تەنانەت تاقە جارێکی چاو لە تەرمەکە نەکرد، خۆی نەدایە دەست خەمۆکی و یەکەم کەس بوو کە لە ژوورەکە چووە دەرێ.

سەرسەرا کەسی لێنەبوو، بەڵام گراسیم بە هەڵەداوان لە ژووری تەمەکە هاتە دەرێ و بە دەستە بەهێزەکانی کەڵپۆسەکانی لادا تاکوو کەڵپۆسەکەی پیتێر ئیڤانۆڤیچ بدۆزێتەوە و بۆ لەبەرکردن یارمەتیی بدا.

پیتێر ئیڤانۆڤیچ دەیویست بڵێ: «زۆر دڵتەزێنە، وانییە؟» بەڵام وای بەباش زانی بە گوتنی «زۆر باشە گراسیم» بە شێوەیەک سپاسی لێبکا.

گراسیم لەگەڵ ئەوەی ددانە سپی و ساغە دێهاتییەکەی وەدیار دەکەوت گوتی:

– خواستی خوایە، هەموومان ئەوەمان لەڕێیە.

گراسیم وەک کەسێک کە کارێکی خێرای هەبێ بە توندی دەرگاکەی کردەوە، بانگی لە عارەبانەچییەکە کرد و یارمەتیی پیتێر ئیڤانۆڤیچیدا تاکوو سواری عارەبانەکە بێ و بەپەلە گەڕایەوە بۆ سەرسەرا تاکوو بە دوای کارێکی دیکەدا بچێ.

دوای ڕزگاربوون لە دەست بۆنی تەرم و عوود و ئەسیدفینیک، هەوای تازە بۆ پیتێر ئیڤانۆڤیچ زۆر خۆش و سازگار بوو.

عارەبانەچی لێیپرسی:

– بچم بۆکوێ، قوربان؟

جارێ درەنگ نەبووە سەرێک لە ماڵی فیێدۆر ڤاسیلییەڤیچ هەڵدێنم.

بەمشێوەیە چوو بۆ ماڵی فیێدۆر ڤاسیلییەڤیچ و بۆی دەرکەوت کە تازە دەستی یەکەمی یارییەکەیان تەواو کردووە و ئەو دەیتوانی بە ئاسانی لە یارییەکەیاندا بەشداری بکات و ببێتە پێنجەمین کەسی بەشدار بوو.



## (٢)

سەربردەی ژیانی ئیڤانئیلیچ سادەترین و ئاساییترین و هەر بەو هۆیەش ترسناکترین شێوەی ژیان بوو. ئەو ئەندامی پلەبەرزی دادگا بوو و لە تەمەنی چلو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. باوکی کارمەندی فەرمیی دەوڵەت و خاوەنی پێشینەیەکی پڕشنگدار بوو کە دوای خزمەت لە فەرمانگە و وەزارتخانە جۆراوجۆرەکاندا لە پترزبۆرگ پلەوپایەی بەرزی بەدەست هێنابوو. ئەم جۆرە کارمەندانە ئەگەرچی بە ئاشکرا شایانی بەدەستەوە گرتنی هیچ پلەوپایە و بەرپرسایەتییەک نین، بەڵام بە هۆی ڕابردووی پڕشنگدار و خزمەتی درێژخایەن ناتوانن لەسەر کار لایانبەن و شوغڵ و ئیشی بێبنەمایان بۆ دادەتاشن تاکوو بە وەرگرتنی مووچەیەک بە بڕی شەش هەزار تا دە هەزار ڕۆبڵ ژیانێکی ئاسوودە ڕابوێرن. ئەندامانی شۆڕای مەحرەمانە بەو جۆرە کار و ئەرکە درۆیینانە ڕۆژگاریان دەبردەسەر و باوکی ئیڤانئیلیچ، ئیلیا ئیپیمۆڤیچ گۆلۆڤین یەکێک لەوانە بوو.

باوکی ئیڤانئیلیچ سێ کوڕی هەبوو کە ئیڤانئیلیچ ناونجییەکەیان بوو. کوڕە گەورەکەی لە دایرەیەکی دیکە شوێنی باوکی گرتبۆوە و لە کاردا بە قۆناخێک گەیشتبوو کە دەیتوانی بە شوغڵگەلێکی وەک شوغڵی باوکی بگا. کوڕی چکۆلەشی خوێڕی و دەستەوەستان بوو، ئەو گەلێکی هەلی باش لە کیس خۆی دابوو و لە ئاکامدا لە فەرمانگەی هێلاسن دامەزرابوو؛ باوکی و براکانی و بەتایبەت

براژنەکانی نەک چاوی دیتنی ئەویان نەبوو، بەڵکوو حەزیان نەدەکرد تەنانەت ئەو کوڕە چارەڕەشەیان هەر وەبیر بێتەوە، مەگین زۆر ناچار بووایەن. خوشکی شووی بە بارۆن گرێف[1] کردبوو کە خاوەنی پلەیەکی فەرمیی پترزبۆرگی بوو کە لە چەشنی ئەو پلەوپایانە بوو وا بە باوکی دەدران. بەجۆرێ کە خەڵکی دەیانگوت، ئیڤانئیلیچ باشترین ئەندامی بنەماڵەیە. ئیڤانئیلیچ نە وەکوو براگەورەکەی ساردوسڕ و نەدوێن و نە وەکوو براچکۆلەکەشی سەرەڕۆ بوو. ئیڤانئیلیچ پیاوێکی سازگار و قوڕساخ و بەهۆش بوو، لە ڕوانگەی کەسایەتیشەوە وەکوو ناونجییەکی ئەوان دەهاتە ئەژمار. ئیڤانئیلیچ و برا چکۆلەکەی خوێندکاری زانکۆی ماف بوون، بەڵام برا چکۆلەکەی نەیتوانی دەورەی زانکۆکەی تەواو بکات و لەساڵی پێنجەمدا دەرکرا. بەڵام ئیڤانئیلیچ بە سەرکەوتوویی دەورەکەی تەواو کرد. ئیڤانئیلیچ لە زانکۆی مافیش کەسێکی باش و هێژا بوو: ڕووخۆش، ئاکارجوان، ڕۆحسووک و وردبین بوو لە بەڕێوەبەردنی ئەرکەکانی خۆیدا هەمیشە سەرکەوتوو بوو. ئەو بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە ئەو جۆرە بێ وا سەرانی دایرەکەی دەخوازن. هەر لە منداڵییەوە زاتێکی پەپوولەئاسایی هەبوو، وەک چۆن پەپوولە بۆلای شۆق و ڕووناکی دەفڕێ ئەویش ئاوا تامەزرۆی خەڵکانی خاوەن پلەوپایەی باڵا بوو. ئیڤانئیلیچ ڕەوشتی کەسانی سەرکەوتوو و پلەبەرزی کۆمەڵگای دەکردە سەرمەشقی خۆی و بەهەر شێوەیەک بۆی بلوایە

1 Baron Greff



پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ دادەمەزراندن. ئیڤانئیلیچ زۆر زوو هەموو شەوق و زەوقەکانی دەورانی منداڵیی تێپەڕاند و بێئیختیار بوو بە لاساییکەرەوەی ئەو کەسانەی کە هەموو فیکر و زیکریان بریقەو باقی ژیانە و بەس. سەرەتا دەیویست لەو ئاکارانە دوورەپەرێز بێ کە بە شێوەی خۆماک بە نادروستی دەزانین بەڵام وردە وردە کەوتە ژێر کاریگەریی ئاکار و کەسایەتیی خەڵکانی پایەبەرز و کردەوە و هەڵسووکەوتەکانی بێئیختیار و بەرەبەرە گۆڕانی بەسەردا هات.

لە زانکۆی ماف جۆرێکی هەڵسووکەوت دەکرد کە لە ڕابردوودا زۆر بە کارێکی خراپ و نەشیاوی دەزانین و تەنانەت بە کردەوەیەکی قێزەونیشی دەهێنا ئەژمار. بەڵام دواتر کە دیتی کەسانی پایەبەرز ئەو ئاکارە ناحەزانە ئەنجام دەدەن و بە کارێکی باشیشی دەزانن، بێئەوەی ئەو کارانەیان پەسند بکات چاوپۆشیی لێدەکردن و بە دیتنی ئەو کارو کردەوانە تووشی ئازاری ویژدان نەدەبوو.

ئیڤانئیلیچ زانکۆی مافی تەواو کرد و دوای هاتنەدەرێ لە گورووپی دەهەمی زانستگا بۆ کڕینی کەلوپەل و جلوبەرگی فەرمی پارەی لە باوکی وەرگرت، چوو بۆلای شارمێری[1] بەرگدروو و دەستێکی لیباسی مۆدەی ڕۆژ بە دووریندا، میدالیایەک کە دەستەواژەی «داهاتووبینبە[2]»ی لەسەر هەڵکەندرابوو بە زنجیری کاتژمێرەکەیدا هەڵیواسی و ماڵئاوایی لە مامۆستایان و بەرپرسانی

1 Scharmer
2 Bespice finem

زانکۆ کرد. لە ڕیستۆرانتی دۆنۆن[1] لەگەڵ هاوپۆلەکانی شێوی خوارد و بە جانتایەکی تازە و مۆدەی ڕۆژ، کە پڕبوو لە جلوبەرگ و کەلوپەلی نوێ و قاڵیچەیەکی سەفەری کە هەموویانی لە باشترین فرۆشگەکان کڕیبوو، پاشان بەرەو شارێک وەڕێ کەوت کە باوکی لەوێ دەستڕۆیشتوو بوو و لەوێ وەک کارمەندێکی فەرمی وەریانگرت و دایانمەزراند.

ئیڤانئیلیچ لە شوێنە تازەکەی هەروەکوو زانکۆی ماف، جگە لەوەی شوغڵێکی باشی دەستکەوت، بۆ پڕکردنەوەی کاتی بێکاری و ڕابواردنیش هەلوومەرجێکی باشی بۆ ڕەخسا. هێندێجار سەردانی ناوچە و گوندەکانی دەکرد. لە کاتی ئەو سەردانانەدا بە شێوەیەکی قورساخانە و جوامێرانە هەڵسووکەوتی لەگەڵ ژێردەستان و باڵادەستەکانی دەکردو ئەو ئەرک و کارانەی پێیدەسپێردرا کە بەتایبەت پێوەندیی بەو تاقمەوە بوو کە لە دین لایاندابوو[2]، بە وردی و سەداقەتەوە ئەنجامی دەدان و بە شانازیی دەزانی، لە ئاکامیشدا هەستی بە غورووور و ڕۆحزلی دەکرد.

ئیڤانئیلیچ ئەگەرچی حەزی لە هێندێ ئاکاری هەرزەکارانە و تایبەتی تەمەنی خۆی هەبوو، بەڵام لەڕادەبەدەر پارێزگار و وردبین و تەنانەت سەختگیریش بوو. لە کۆمەڵگادا پیاوێکی قسەخۆش و دەم بە بزە و شۆخیباز بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا زۆری ڕێز بۆ خەڵک و دابو

1 donon

٢- ئەو تاقمە کەسانێکی ئایینی بوون کە لە سەدەی نۆزدەدا لە کلێسەی ئۆرتۆدۆکس جیابوونەوە و دوای ئەوە یاسا هێندێ سنووری یاسایی بۆ دانان.



نەریت دادەنا، بەجۆرێک کە سەرۆکی قەزا و ژنەکەی ـ کە ئیڤانئیلیچ وەک ئەندامی بنەماڵەی خۆیان چاوی لێدەکرد ـ دەیانگوت: زۆر کوڕی چاکە[1].

لە شوێنی تازەی کارەکەی لەگەڵ خانمێک کەینوبەینی پەیدا کرد و ئەو خاتوونە زۆر شەیدا و ئاشقی ئیڤانئیلیچی لاو و تەڕپۆش بووبوو، هەروەها لەگەڵ فرۆشیارێکی کڵاوی ژنان و کەلوپەلی ئارایشی پێوەندیی نهێنی دامەزراند و لەگەڵ ئەو ئاجوودانانەش کە ڕەوانەی ئەوێ دەکران بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی دادەنیشت و خەریکی بادەنۆشی دەبوو. لە گەڕەکە لاپەڕەکانی شار کە شوێنی نەهەنگ و خۆشڕابواردن بوون، پیاسەی دەکرد. کاتێک لەگەڵ سەرۆکی قەزا یان ژنەکەی سەرۆک بەرەوڕوو دەبوو دەستی دەکرد بە خۆشیرینکردن و جامەلووسکێ. بەڵام هەموو ئەو کارانەی بە ڕوویەکی خۆش و لە کاتێکدا ئەنجام دەدا کە بتوانێ کەڵک لە زانیارییەکانی لە بواری فەڕەنسیدا وەربگرێ. بە گشتی هیچ ئیرادێکی نەبوو. پەندێکی فەڕەنسی دەڵێ: «سەردەمی لاوی حەز و خولیای تایبەت بە خۆی هەیە[2].»

ئیڤانئیلیچ پێنج ساڵ بەو شێوەیە خزمەتی کرد. پاشان لە ژیانی فەرمانبەریی ئەودا گۆڕانێک ڕوویدا. چەند ئیدارەیتری پێوەندیدار بە دادگا دەمەزران و هەرکامەیان فەرمانبەری تازەیان پێویست بوو. ئیڤانئیلیچ یەکێک لەو کارمەندە تازانە بوو. پێشنیاریان پێکرد لە

1 Bon enfant
2 ll faut gue jeunesse se passe

پارێزگایەکی دیکە ببێتە بازپرسی دادگا. ئەگەرچی ناچار بوو هەموو ئەو پێوەندییانەی سازی کردبوو لە دەستیان بدا و پێوەندیی تازە دامەزرێنێ، بەڵام پێشنیارەکەی قەبووڵ کرد. هاوڕێ و دۆستەکانی کۆڕێکی ماڵئاواییان سازکرد و وێنەی دەستەجەمعییان کێشا و قوتووە جگەرەیەکی زێویان بە دیاری پێدا. دوای ماچوموچ و ماڵئاوایی لەگەڵ هاوکار و دۆستانی بەرەو شوێنی تازەی کارەکە وەڕێکەوت.

ئیڤان‌ئیلیچ کە پلەی بازپرسی دادگاشیان پێسپارد، وەک ئەوکاتەی کە وەکوو فەرمانبەری خزمەتگوزاریی تایبەت کاری دەکرد، پیاوێکی هێژا و بەڕێز بوو، بۆیە کەوتبووە بەردڵی هەمووان و ڕێزیان بۆ دادەنا. ئەو توانیی ئیشی ئیدارییەکەی لە ژیانی تایبەتیی جیا بکاتەوە. ئەرکەکانی وەکوو بازپرسی دادگا زۆر سەرنجڕاکێشتر و خۆشتر لە ڕابردوو بوو. ئەو بەڕاستی کەیفی بەو جلوبەرگە فەرمییە دەکرد کە شارمێری بەرگدروو بۆی درووو بوو، بەتایبەت کاتێک کە بە نێو ئەو کەسانەدا دەڕۆیشت کە بۆ سکاڵا یان سەردان و کارێکی ئیداری بۆلای سەرۆکی قەزا هاتبوون و بۆ دیتن و کاروبار و سکاڵاکانیان کەوتبوونە دڵەخورپە. ئەو خەڵکە کە دەیاندی ئەو زۆر بە ئاسانی و بە ئارامی بۆ خواردنەوەی چایی و کێشانی جگەرە ملّپێوە دەنێ و دەڕوا بۆ ژووری سەرۆک هەموو بەخیلییان پێدەبرد. هەڵبەت کەسانێک هەبوون کە ڕاستەوخۆ لەگەڵی لە پێوەندیدا نەبوون. ئەوانەی کە لەگەڵی لە پێوەندیدا بوون زیاتر فەرمانبەری پۆلیس و ڕاسپاردەی تاقمخوازان بوون. ئیڤان‌ئیلیچ لەگەڵ ئەو کارگێڕ و



ڕاسپاردانە زۆر بەڕێز و تا ڕادەیەک دۆستانە هەڵسووکەوتی دەکرد، بەو ئاکارانەش پێیدەسەلماندن کە ئەگەرچی توانایی ئەوەی هەیە سووکایەتییان پێبکا بەڵام وای بەباش دەزانێ کار و ئاکاری دۆستانە و مرۆڤ‌دۆستانە بێ. ئەو ئێستا خاوەنی پلەوپایەی بەرز بوو و وەک بازپرسی دادگا هەستی دەکرد هەمووان بە بێجیاوازی تەنانەت گرینگترین و بەرزەدەماخترین کەسی ئەو شارە لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی ئەودان. هەر ئەوەندە بەس بوو چەند وشە لەسەر کاغەزێک بنووسێ و هەرکەسێک جا لە هەر پلەوپایە و مەنسەبێکدا بووایە وەکوو تۆمەتبار یان شایەد بانگی بکات و ئەگەر ئیجازەی نەدایە دانیشێ، کەسی بانگ‌کراو ناچار بوو لە هەمبەریدا هەروا بە پێوە ڕاوەستێ و وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە. بەڵام ئیڤان‌ئیلیچ هیچکات کەڵکی نابەجێی لە دەسەڵاتەکەی خۆی وەرنەگرت، بەردەوامیش لە هەوڵی ئەوەدابوو مرۆڤێکی باش بێت و کارەکانی ژیرانە و گونجاو بن و خەڵک لە دەستی وەڕەز نەبن و وەزاڵە نەیەن. هەستی دەسەڵات و دەسەڵاتی بیروڕا دەربڕین لە کردەوەکانیدا کاتێک تۆمەتباری بانگ دەکرد یان خەڵک بۆ سکاڵا دەهاتن بۆلای ئەوەندەیتر ئیشەکەی لەبەر چاوی شیرین دەکرد و هەستی غوروور و دەسەڵاتخوازییەکەی لە ناخیدا پاراو دەکرد. لەو ئیشە تازەیدا، بەتایبەت لە لێپرسینەوەکانیدا، لەوە گەیشتبوو کە هەموو ئەو بابەتانە دەرهاوێژێ کە لە ڕوانگەی یاساوە پێوەندییان بە پەروەندەکەوە نییە و بیروڕای خۆی بەسەر دۆخەکەدا نەسەپێنێ. لە هەموو کەس زیاتر هەوڵی دەدا لە کارەکاندا تەشریفاتی یاسایی لەبەر چاو بگیرێ و کارو

بارەکان یاسایی بن. ئیڤان‌ئیلیچ لەو کەسانە بوو کە یەکەمجار یاسای نوێی ٦٤ی بەڕێوە برد[1].

لەو شارە تازە کە شوغڵی بازرەسیی دادگای وەرگرت، زۆری دۆست و ئاشنای تازە پەیدا کرد و لەگەڵیان پێوەندیی دامەزراند. پێی‌نایە ڕێگایەکی نوێ و ڕەوشتێکی جیاوازی گرتەبەر. لەگەڵ کەسانی پایەبەرز و بەدەسەڵاتی شارەکە دادەنیشت و هاتووچۆی دەکردن. تاوای لێهات خەباتێکی نەرمی فیکریی دژ بە حکوومەت دەستپێکرد و خۆی وەک لیبراڵێک و هاووڵاتییەکی خاوەن ژیار ناساند. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دەدا بۆشناغی و ڕازاوەیی خۆی ڕاگرێ. بەڵام ئیتر ڕیشی نەدەتاشی. ئیڤان‌ئیلیچ لەو شارە تازە بە تەواوی ماڵ و سامانی پێکەوە نا، جێی خۆی لە دڵی خەڵکیدا کردەوە و ئەو کەسانەی کە حەزیان بە چارەی سەرۆکی قەزا نەدەکرد لەگەڵ ئەو دۆستایەتیی گەرموگوڕیان پێکهێنابوو. مووچەی مانگانەی زیادی کرد و بۆ کاتی پشوودان و ڕابواردن یاریی ڤینتی[2] هەڵبژارد. چونکە لەو یارییەدا زۆر لێزان و تەڕدەست بوو، زۆر باشی یاری دەکرد و هەمیشە بەرەندە دەبوو، بۆیە هەیەجان و ڕابواردنی ئەو یارییە ئەوی دڵخۆش و ڕازی نەدەکرد. دوای دوو ساڵ لەگەڵ هاوسەری داهاتووی، پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا میخێل[3] ئاشنا بوو. ئەو دڵڕفێنترین و زیرەکترین و شۆخوشەنگترین کچ بوو لەو

١- دوای ڕاگەیاندنی ئازادیی ڕەعیەتەکان لە ساڵی ١٨٦٤دا، لە یاسای مەدەنیی ڕووسیادا گۆڕانێکی بنەڕەتی ساز بوو. لێرەدا مەبەست ئەو قانوونە مەدەنییە نوێیەیە.
٢- Vint یارییەکە بە وەرەق دەکرێ.
3 Praskovya fedorovna Mikhel



بنەماڵانەدا کە ئیڤان‌ئیلیچ هاموشۆی دەکردن. زۆر زوو لەگەڵ پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا پێوەندیی ئاشقانەی دامەزراند.

کاتێک کارگێری خزمەتگوزاریی تایبەت بوو، سەما کردن بۆ ئەو وەک کارێکی ئاسایی دەهاتە ئەژمار، بەڵام ئێستا کە وەکوو بازپرسی دادگا سەمای دەکرد، تەنیا بەو هۆیە بوو کە نیشان بدات ئەو لە سەماشدا وەکوو کارەکانی دیکەی سەر و شانێکی لە سەرووی خەڵکەوەیە. هێندێجار لەگەڵ پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا سەمای دەکرد و هەر لە کاتی ئەو سەماکردنانەدا بوو کە کچەی سازکرد. پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا بە دڵ ئاشقی بوو. سەرەتا ئیڤان‌ئیلیچ لە باری پێکهێنانی ژیانی هاوبەشەوە بڕیارێکی ڕوونی نەدابوو، بەڵام کاتێک کچە ئاشقی بوو بەخۆی گوت: «بەڕاستی بۆ ژیانی هاوبەش پێکنەهێنم؟»

پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا بەژن و باڵا جوان و خاوەن ماڵ و سامان و هەروەها لە بنەماڵەیەکی باش و خانەدانیش بوو. هەڵبەت ئیڤان‌ئیلیچ دەیتوانی ژنێکی لەو باشتریش بێنێ، بەڵام ئەوەش هەڵبژاردنێکی خراپ نەبوو. ئەوان لە ئاکار و خووخدەدا هیچ وێکچوونێکیان نەبوو بەڵام پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا ئاشقی ئیڤان بوو و هەر لەوکاتەشدا زەماوەندی ئەوان لە ڕوانگەی کەسانی پایەبەرز و خاوەن دەسەڵاتەوە کە لەگەڵ ئیڤان دۆستایەتیی نزیکیان هەبوو، بە کارێکی باش دادەنرا. بۆیە ڕازی بوو ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پراسکۆڤیا فێدرۆڤنا پێکبهێنێ.

وەڕێخستنی جێژنی زەماوەند و دەستپێکردنی ژیانی ژنومێردایەتی و خۆشەویستیی دوولایەنە و شتومەک و کەلوپەلی ماڵ و جلوبەرگی نوێ ڕەنگێکی جوانی بە ژیانی بەخشیبوو، ئەو خۆشی و جوانیانەش

هەتا ئەوکاتەی ژنەکەی زگی پڕبوو درێژەی کێشا. بۆیە ئیڤان‌ئیلیچ پێیوابوو ژیانی هاوبەشی نەک هێمنایەتیی ژیان تێکنادات بەڵکوو ڕێزی تایبەتی کۆمەڵگاشی پێوەیە و بە چاوێکیتر لێیدەڕوانن. بەڵام ئەم فکرە زۆری نەخایاند و لە یەکەم مانگی دووگیان بوونی ژنەکەیەوە بڕێک ناخۆشی و وردەکێشە لە نێوانیاندا سەریهەڵدا. هاوسەرەکەی لەخۆڕا و بەبێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا کێشەی سازدەکرد و زیز دەبوو. دەیویست ئیڤان‌ئیلیچ تەواوی بیر و فکر و کاتی خۆی بۆ ئەو تەرخان بکات و تا ڕادەیەکی زۆر دڵپیسیی لێدەکرد. ئەم دڵپیسیی و ناسازگارییانەی پڕاسکۆڤیا بووە هۆی ئەوەی کێشە و هەڵڵا لە نێوانیاندا هەڵگیرسێ.

سەرەتا ئیڤان هیواداربوو بتوانێ چاوپۆشی لەو کێشە و پرتەوبۆڵانە بکات، بەڵام کە بۆیدەرکەوت ناتوانێ و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ کێشەکان گەورەتر دەبوونەوە، بڕیاریدا زیاتر کاتەکانی لەگەڵ دۆست و هاوڕێیانی ڕابوێرێ، بەڵام ژنەکە زۆر زوو نارەزایەتیی لەو کارەشی دەربڕی. دوای ئەوەی پراسکۆڤیا تەواوی کەمایەسی و ئاریشەکانی دەخستە ئەستۆی ئەو و بە سووکایەتی پێکردن و تووڕەیی ناچاری دەکرد پێملی بێت و دڵڕەقانە ئەسپی خۆی تاودەدا. ئەو دەیویست ئیڤان هەمیشە لە ماڵێ بێت و ئەوەی هاوسەرەکەی پێیدەڵێ لە قسەی دەرنەچێت و هەرچۆنێک دەبێ تاملی بکات. دوای ئەوە بوو کە ئیڤان لە مانای ڕاستەقینەی ژیانی ژنومێردایەتی تێگەیشت و بۆی دەرکەوت ژیان لەگەڵ پراسکۆڤیا، نەک شاد و چێژبەخش بەڵکوو بە پێچەوانە زۆر پڕئازار و ناخۆشە و ئیتر بۆی تامڵ ناکرێ. ئیڤان لە ماڵێ هەستی دەکرد هیچ ڕێزێکی لێناگیرێ و ئاوڕی لێنادرێتەوە بۆیە هەوڵی دەدا ئەو



کەمایەسییە لە شوێنی کارەکەی و لە نێو خەڵکدا قەرەبوو بکاتەوە. لەدایکبوونی منداڵەکەیان و تێکۆشانی بۆ دابینکردنی خۆراک و جلوبەرگ و کێشە جۆراوجۆرەکانیتر و هەروەها نەخۆشکەوتنی منداڵەکە و دایکی، ئەوەندەیتر پێویستی بە هاودەردیی ئیڤان هەبوو و کەمتەرخەمیی ئەو ژنەکەی زیاتر تووڕە و بێزار دەکرد. هەر ئەوەش هۆکارێک بوو کە ئیڤان‌ئیلیچ قورساییی کارەکانی خۆی زیاتر بگوێزێتەوە بۆ شوێنی کارەکەی و دڵی بە ماڵێ خۆش نەبێ. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی زیاتر هۆگری پلەوپایەی بەرز و دەسەڵاتخوازی بێ.

ئیڤان‌ئیلیچ یەکەم ساڵی زەماوەندەکەی بۆی دەرکەوت ئەگەر بیهەوێ ژیانی بە دڵی کۆمەڵگا بێ، دەبێ وەکوو کارە ئیدارییەکانی لە ماڵێش هەڵسووکەوتێکی نەرم و سازگارانە بگرێتە پێش. ئەو تەنیا پاراستنی ڕواڵەت و لەبەرچاو گرتنی دابونەریتێک کە بە دڵی خەڵک و کۆمەڵگا بێ بەلایەوە گرینگ بوو، یانی هەبوونی ماڵ و ژیانی بە ڕواڵەت باش و هەروەها بوونی ژن و منداڵیش بەشێک بوو لەو ژیانە کە ئەو بیری لێدەکردەوە. ئەو کاتانەی کە بارودۆخەکە بە دڵی ئەو بوو شوکری خودای دەکرد و کاتێکیش کە تووشی کێشە و ناسازگاری دەبوو دەموچاوی بە یەکدا دەدا و ڕقی هەڵدەستا؛ هەر خێراش دەگەڕایەوە بۆ دنیا کۆمەڵایەتییەکەی کە تایبەتی خۆی بوو و کەمایەسییەکانی لەودا قەرەبوو دەکردەوە.

ئیڤان‌ئیلیچ کارمەندێکی شیاو و حیسابی دەهاتە ئەژمار و دوای سێ ساڵ بوو بە جێگری دادستان. ئەرکی تازە و گرینگایەتییەکەی، تواناییی ئەوەی پێدابوو کە هەرکەسێکی پێخۆشبوایە و بە دواداچوونی بۆ بکات

و بیخاتە بەندیخانەوە، ناوبانگ و سەرکەوتن لە کارەکانی دادگادا ئەوەندەی‌تر ئیشەکەی لە بەرچاوی شیرین و شیرینتر دەکرد. منداڵەکانی زیادیان کرد و هاوسەرەکەشی زۆر زیاتر لە پێشوو ڕووگرژی و تووڕەیی تۆسنیی کردە پیشە. بەڵام ڕەوشتێک کە ئیڤان لە هەمبەر ژیانی بنەماڵەدا گرتییەبەر، کاریگەرییە سەلبییەکانی ژنەکەی کەم کردەوە.

دوای حەوت ساڵ خزمەتکردن لەو شارە، بە پلەی دادستانی گوێزرایەوە بۆ شارێکی دیکە. بەڵام کە چوون بۆ شوێنی تازە و بۆیان دەرکەوت مووچەکەی بەشی خەرجییان ناکا و ژنەکەشی حەزی بەو شوێنە نەدەکرد، خەم و خەفەت دڵی ڕێک‌گوشی. لەو ئیشە تازەیدا مووچەی زیاتری وەردەگرت بەڵام خەرجی ڕۆژانەی چووبووە سەرێ. کاتێک دوودانە لە منداڵەکانی لەدەستدا، زیاتر لە پێشوو چوارچێوەی بنەماڵەی لەبەرچاو کەوت.

پراسکۆڤیا فیدرۆڤنا لە هەموو باس و ئاخافتنێکدا هاوسەرەکەی لۆمە دەکرد. زۆربەی باسەکان لەسەر پەروەردە و فێرکاریی منداڵەکانیان بوو، هەر ئەوەش دەبووە هۆی ئەوەی کێشە و نێوان‌ناخۆشییەکانی هەڵەسوون بێنێتەوە. زۆر کەم وابوو هەست بە ئەشق و خۆشەویستی بکەن کە ئەویش زۆری نەدەخایاند. ئەو ساتانەی خۆشی و دڵۆڤانییان تێدا بوو وەکوو دورگەی چکۆڵە وابوون کە هێندێ‌جار لە کەناریدا لەنگەریان دەخست و دیسان لەنگەریان دەکێشا و بەرەو پانتایی ئۆقیانووسی ڕق و تووڕەیییەکی شاراوە دەڕۆیشتن. ئەم ڕق و تووڕەیییەش لەو ساردوسڕی و لە یەکتر نامۆ بوونانەدا ڕەنگی دەدایەوە کە دەرهەق بە یەکتر هەڵسووکەوتیان هەبوو. ئەگەر ئیڤان لە



ڕابردوودا بە دیتنی ئەو هەڵسووکەوتانە خەم دایدەگرت، وردە وردە خووی بەو بارودۆخەش گرت. هەرکاتێک کە ماوەیەکی کورتی لەگەڵ بنەماڵەکەی ڕادەبوارد هەستی بە تۆزە ئۆخژنێکی ڕۆحی دەکرد و هەرکاتێک ناچار دەبوو لە ماڵەوە بمێنێ، کەسێکی غەریبەی بۆ ماڵەوە بانگهێشتن دەکرد و حەسانەوە و هێمنایەتیی خۆی دابین دەکرد. وەلحاسڵ ئەو تەواوی وزە و توانای خۆی بۆ ئیشە ئیدارییەکانی تەرخان دەکرد و هەر ئەوەش حەز و هۆگرییەکەی زیاتر دەکرد و لە کار ماندوو نەدەبوو.

ئاگاداربوون لە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و توانایی لە بەڕێوەبردنی هەرکارێک کە بیویستایە، هەڵسووکەوتی نەرمونیان و ڕووخۆشی لەگەڵ دۆستان و هاوکاران، بەتایبەت ئەو میوانییانەی بۆ یاریی پاپەزێن ساز دەکران شادی و نەشەیان بە ژیانی دەبەخشی. بۆیە ئیڤان‌ئیلیچ لە ژیانی خۆی ڕازی بوو و خۆشی پێی‌وابوو دەبێ هەروابێ.

بەو شێوەیە حەوت ساڵ تێپەڕی. کچە گەورەکەی شازدە ساڵان بوو. یەکێکی‌تر لە منداڵەکانی مرد و تەنیا کوڕێکی مابوو، کوڕە قوتابییەک بوو کە زۆربەی کێشە و دەمەقاڵێی بنەماڵەکەیان بە هۆی ئەوەوە بوو. ئیڤان‌ئیلیچ دەیویست ئەو کوڕەی بنێرێتە فێرگەی ماف، بەڵام پراسکۆڤیا فیدرۆڤنا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو دژایەتی بکات ناردی بۆ قوتابخانەی وێژە و ئەدەب. کچەکەیان لە ماڵەوە پەروەردە کرا و خوێندی، کوڕەکەشیان لە خوێندن و فێربووندا زیرەک و خاوەن مرخ بوو.

## (٣)

ئیڤانئیلیچ بەو شێوەیە حەڤدە ساڵ ژیانی ژنومێردایەتیی ڕابوارد. ئەو ئیتر دادستانێکی بە ئەزموون بوو. چەندین پێشنیاری ئیشکردنی ڕەت کردبۆوە و چاوەڕوانی پلەوپایەی باشتر بوو کە ڕووداوێکی کتوپڕ و ناخۆش هێمنایەتیی ژیانی تێکدا. ئەو چاوەڕوانی ئەوە بوو پێشنیاری پێبکەن ببێتە سەرۆکی کۆلێژی ماف لە زانستگای شار، بەڵام کەسێکی دیکە بە ناوی هاپ[1] هاتە پێشێ و ئەو مەقامەی وەرگرت. ئیڤان زۆر تووڕە بوو، هاپی لۆمە کرد و لەگەڵ ئەو و سەرۆکی شارەوانی کەوتە کێشەوە، سەرۆکی شارەوانی ئەوی لەبەرچاو ڕەش بوو و کاتێک پلە و ئیشی باشتر هەڵدەکەوت گرینگی بە ئیڤانئیلیچ نەدەدا.

ئەم ڕووداوە بۆ ساڵی  دەگەڕێتەوە؛ یانی دژوارترین ساڵی ژیانی ئیڤانئیلیچ. ئەو لە لایەکەوە بۆی دەرکەوت مووچەکەی بەشی خەرج و دابینکردنی ژیانی ڕۆژانە ناکات، لە لایەکیتریشەوە سەرۆکە پایەبەرزەکان هیچ گرینگییەکیان پێنەدەدا. هەمووان، تەنانەت باوکیشی کە دەیاندی ٥ ڕۆبڵ مووچە وەردەگرێ، تەواو شتێکی ئاسایی بوو بە لایانەوە و تەنانەت ئەویان بە بەختەوەریش دەزانی. ئیڤان لە ناخی دڵەوە هەستی بە تەنیایی و تێکشکان دەکرد و تەنیا خۆی دەیزانی کە ژیانی خەریکە لەبەریەک هەڵدەوەشێ.

1 Happe



هاوین بۆ ئەوەی هێندێ لە خەرجی ڕۆژانە کەم بکاتەوە و پاشەکەوتی بکات، مۆڵەتی وەرگرت و لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکەی ڕۆیشتن بۆ زۆزان شوێنی ژیانی ژنبراکەی. لەوێ بۆ یەکەمجار لە ژیاندا، گوشاری ڕۆحی و خەفەتێکی تاقەتپڕووکێنی هەست پێکرد و بۆی بوو بە ئەزموونێک. بۆیە بەو ئاکامە گەیشت کە درێژەپێدان بەو شێوە ژیانە ناگونجێ و پێویستە بڕیارێکی جیددی بدات. شەوێک هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوی و لە بەرهەیوانی ماڵەکە پیاسەی کرد، بەیانیش بڕیاریدا بچێت بۆ پترزبۆرگ، لەوێ جموجۆڵێک لە خۆی نیشان بدات و ئەو کەسانەی بوونەتە هۆی شکست و هیوابڕاوبوونی تەمبێیان بکات و بەو بۆنەوە بۆ وەزارەتخانەیەکیتر بگوێزرێتەوە.

ڕۆژی دوایی، ئەگەرچی پراسکۆڤیا فیدرۆڤنا و براکەی ڕازی نەبوون بەرەو پترزبۆرگ وەڕێ کەوت. بڕیاری دابوو پیشەیەک پەیدا بکات کە مووچەکەی ساڵانە پێنج هەزار ڕۆبڵ بێ. ئەو ئیتر حەزی لە هیچ جۆرە ئیش یان فەرمانگەیەکی تایبەت نەبوو. تەنیا شتێک کە دەیویست ئیشێک بوو کە مووچەکەی پێنج هەزار ڕۆبڵ بێ. جا هەر فەرمانگە و وەزارەتخانەیەک بێ جیاواز نەبوو؛ بۆ وێنە بانک، هێڵاسن، یەکێک لەو ڕێکخراوانەی کە سەربە «ئیمپرێس ماریا[1]»ن یان تەنانەت لە گومرک.

ئیڤانئیلیچ لەم سەفەرەیدا لەگەڵ سەرکەوتنێکی سەرسووڕهێنەر و چاوەڕواننەکراو بەرەوڕوو بوو. لە شاری کورسک[2]، لەگەڵ

1 Empress Marya
2 Kursk

ئێف.ئای.ئیلین[1] که یەکێک لە ئاشناکانی بوو، سواری شەمەندەفەری نمرە یەک بوون، پێکەوە بوونە هاوسەفەر و باس هاتە سەر تێلگرافێک کە تازە گەیشتبووە دەستی سەرۆکی شارەوانیی کورسک. لەوێدا ڕاگەیەندرابوو کە گۆڕانکارییەک لە وەزارەتخانەدا پێکدێ: پیتێر ئیڤانۆڤیچ دەبێتە جێگری ئیڤان سێمێنۆڤیچ[2].

ئەو گۆڕانەی باسکرا، جگە لە گرنگایەتییەکەی بۆ ڕووسیا، بۆ ئیڤان‌ئیلیچ گرینگایەتییەکی تایبەتی هەبوو، چونکە بە هاتنە سەرکاری پیتێر ئیڤانۆڤیچ و هەروەها دۆستی نزیکی خۆی زاخار ئیڤانۆڤیچ[3]، باشترین هەل بوو کە بۆ ئیڤان‌ئیلیچ هەڵکەوتبوو؛ چونکە زاخار ئیڤانۆڤیچ جگە لە دۆستایەتی هاوڕێی زانکۆی ئەو بوو.

ئەم هەواڵانە لە مۆسکۆ پشتڕاست کرانەوە. ئیڤان‌ئیلیچ کە گەیشتە پترزبۆرگ، زاخار ئیڤانۆڤیچی دۆزییەوە و بەڵێنی لێ‌وەرگرت کە لە دایرەی داد پیشەیەکی باشی بداتێ کە خۆشی پێشتر کارمەندی ئەوێ بوو. حەوتوویەک دواتر تێلگەڕافێکی بۆ پراسکۆڤیا فێدرۆڤنای خێزانی نارد: «زاخار ئیڤانۆڤیچ بۆتە جێگری میلێر. دوای نواندنی ڕاپۆرت و پەروەندەی پێویست پیشەی دڵخوازی خۆم دەدەنێ.»

ئیڤان‌ئیلیچ لە وەزارەتخانەکەی پێشووی خۆی پیشەیەکی دەست کەوت کە دوو پلە باڵاتر لە هاوکارەکانی پێشووی بوو، مووچەکەشی پێنج هەزار ڕۆبڵ و خەرجی سەفەرەکەشی سێ هەزار و پێنجسەد

1 F.I. Ilyin
2 Ivan Semenovich
3 Zachar Ivanovich



ڕۆبڵ بوو کە دەستبەجێ پێیاندا. تەواوی دڵمەندییەکانی کە بە هۆی ئاکاری هاوکار و دەورووبەرییەکانییەوە بوو لە بیری چۆوە و زۆر دڵخۆش و سەرکەوتوو گەڕایەوە بۆ زۆزان. باسی ئەو میواندارییانەی کرد کە لە پترزبۆرگ بۆیان سازکردبوو و چەندەیان ڕێز لێنابوو. هەروەها باسی دۆستانی لە بنەوبڕ و دوژمنانی بە ڕواڵەت دۆستی کرد کە چۆن شەرمەزار بوون و لەگەڵ ئەوەی بەخیلییان پێ‌دەبرد، خەریکی جامەلووسکێ و تەشیڕێسی بوون و لە پترزبۆرگ چەندە لە دڵی خەڵکدا جێی کردۆتەوە و خۆشیان دەوێ. پراسکۆڤیا بە بیستنی ئەو سەرکەوتن و دامەزرانەی مێردەکەی زۆر شاد و ڕازی دیاربوو. هەرکامەیان مەرام و ئارەزوویەکیان بوو بۆ ئەو ژیانە نوێیە و بۆ یەکەمجار بوارێکی هاوبەش لە نێوانیاندا سازبوو. ژیانیان دوای ئەو ساردی و دابڕانەی پێشوو، جارێکی‌تر کەوتەوە سەر ڕەوتی سروشتی و هیوا و ئەوین ژیانیانی داگرت. ئیڤان دەبوو بچێتە سەر کارە نوێیەکەی و بۆ گەشەپێدان و گەرمداهێنانەوەی ژیانی تازەش پێویستی بە کات بوو. پردی ئاشتی لە نێوان ئەو ژن و مێردەدا هەڵبەسترایەوە، بەجۆرێک کە زۆر لە ساڵانی سەرەتای ژیانی هاوبەشیان تەباوڕەبا و گەرموگوڕتر بوون و چاوپۆشییان لە عەیب و کەموکووڕییەکانی یەکتر دەکرد. ئیڤان کەوتە بیری ئەوەی کە بەبێ ڕاوەستان بنەماڵەکەی لەگەڵ خۆی بەرێ، بەڵام پێداگریی ژنبراکەی و ژنەکەی ئەو کە زۆریان ڕێز لێ‌دەگرتن و لە ماڵەکەیان هەستیان بە نامۆیی نەدەکرد، وایلێکرد کە بە تەنیا بچێت بۆ پترزبۆرگ. ئیڤان شاد و دڵخۆش لەوەی لە کاردا سەرکەوتنی بەدەست

هێناوە و تەبایی و ئاشتی باڵی بەسەر بنەماڵەکەیدا کێشاوە، بەرەو شوێنی تازەی کارەکەی وەڕێ کەوت.

ماڵێکی باشی پەیدا کرد. ماڵێکی گەورە کە ژووری میوانداریيەکەی بە شێوازی قەدیم و ژوورێکی گەورە و جێدار بۆ متاڵاکردن، چەند ژووریش بۆ هاوسەر و کوڕ و کچەکەی، هەر ڕاست ئەو شتەی کە ئەو و هاوسەرەکەی بە ئاواتییەوە بوون.

ئیڤان‌ئیلیچ، خۆی بۆ ڕێکوپێک‌کردن و هەڵبژاردنی کاغەزدیواری و جێبەجێ کردنی کەرەسە و کەلوپەلی ماڵێ قۆڵی هەڵماڵی، بەتایبەت مۆبل و مێزەکان کە ڕووکەشێکی بە شێوەی قەدیمی تێ‌هەڵکێشابوون. هەموو شتێک بە دڵی ئەو بوو و ماڵێکی خۆش و شاهانەی ڕازاندەوە. کاتێک کارەکان نیوە بوون دیتنی جوانی و ڕازاوەیی ماڵەکە زۆر لەوە زیاتر بوو کە ئەو چاوەڕوانیی دەکرد. کاتی خەو بیری دەکردەوە و ژووری ڕازاوەی میوانداریيەکەی دەهێنایە بەرچاوی خۆی. کاتێک ماڵەکە ئاماه ببێ چەندە خۆش و ئاوەدان و پڕشکۆ دەبێ! لە خەیاڵی خۆیدا سۆبەی دیواری و پەردە و دۆڵاب و مۆبل و کورسیی چکۆڵە و دەوریی جوان و وێنەداری بە دیوارەوە هەڵواسراو و پەیکەرە و کەلوپەلی برینجی دەهێنایە بەرچاوی لەوانەبوو لە خۆشیانا بفڕێ. کە دەیدی ژنەکەی و کچەکەشی لەگەڵ ئەو هاوسەلیقەن و دڵیان بە ماڵەکە خۆشە شادی لە دڵی دەگەڕا. ئەوان بەڕاستی چاوەڕوانی ئەم هەموو جوانی و شکۆیەی ماڵەکەیان نەبوون. ئیڤان توانیی هێندێ شتی ئەنتیکەی هەرزان‌بایی بکڕێ کە دیمەنی ماڵەکەی تەواو کردبووە دیمەنێکی ئەشرافی و کۆشک‌ئاسا. کاتێک نامەی بۆ بنەماڵەکەی



دەنووسی باسی ئەوانەی بۆ نەدەکردن تاکوو کتوپڕ چاویان پێی‌بکەوێت و تووشی سەرسووڕمان بن. کاروباری ماڵێ وا بەخۆیەوە سەرقاڵی کردبوو کە تەواوی فیکر و زیکری بەوەوە خەریک بوو نەک کارە تازەکەی، تەنانەت کاتێک لە کۆڕەکانی دادگادا بەشداریی دەکرد بیری هەر لەلای ماڵەکەی بوو. لە خەیاڵی خۆیدا دەیگوت: «پەردەکان ڕاست و ساف هەڵواسم یان چین‌دا بن؟» هێندەی دڵ بە ماڵەکەی خۆش بوو کە زۆرجار خۆی کەلوپەلەکانی ئەمبارەوبار دەکردەوە یان پەردەکانی لێدەکردەوە و دیسان هەڵیدەواسینەوە.

جارێکیان کاتێک دەیویست بە پەیژەکەدا سەرکەوێ تاکوو پیشان پەردەدرووەکەی بدات کە چۆنی هەڵواسێ، لاقی خراپ دانا و خزی. بەڵام هێندە گورج و چالاک بوو کە توانیی خۆی بگرێتەوە و نەکەوێ، لاکەلەکەی درا بە دەستگیرەی پەنجەرەکەدا و زۆری ئێش پێگەیشت. بەڵام هێندە دڵخۆش بوو زوو ژانەکەی لە بیر چۆوە. لە نامەیەکدا بۆ ژنەکەی نووسی: «هەست دەکەم پازدە ساڵ جحێڵ بوومەتەوە.»

پێی‌وابوو هەتا مانگی سپتامبر هەمووشتێک ئامادە دەبێ، بەڵام کارەکە هەتا ناوەڕاست مانگی ئۆکتۆبری خایاند. ئاکامی کارەکەش سەرنجی هەموو بینەرێکی ڕادەکێشا و پێیان باش بوو.

لە ڕاستیدا ماڵەکەی ڕاست وەک ماڵی ئەو کەسانە وابوو کە لە چینی مام ناوەندیی کۆمەڵگان و حەز دەکەن خەڵک بە دەوڵەمەندیان بزانن. پەردەی هاورێشمی گوڵدار و دیکۆڕی دارینەی تۆخ، گوڵ و گیا و قالیچە و کەلوپەلی برینجی تۆخی مشتوماڵ دار و ئەو شتانەن کە خەڵکانی چینی مام‌ناوەندی کۆمەڵگا دەیکڕن و ماڵی پێ‌دەڕازێننەوە

تاکوو خۆیان وەک دەوڵەمەند و زەنگین پیشان بدەن. ئیڤانئیلیچیش ماڵەکەی بەو شێوەیە ڕازاندەوە.

چوو بۆ وێستگەی هێلاسن و بنەماڵەکەی هێنایەوە بۆ ماڵە تازەکەی؛ ماڵێک کە خزمەتکارێک بە بۆینباخی سپییەوە ڕێنوێنیی دەکردن بۆ ژووری. کاتێک چاویان بە هەموو ژوورەکان کەوت و بزە و قریوەی شادی لە ماڵەکە گەڕا، ئیڤان لە خۆشیاندا خەریکبوو شاگەشکەبێ. کاتی عەسرۆژە، کە لەگەڵ پراسکۆڤیا کەوتە ئاخافتن، لە نێوان قسەکانیدا باسی کەوتنەخوارەوەی خۆی لەسەر پەینجەکەی بۆ گێڕایەوە. ئیڤان بە پێکەنینەوە بۆی باس کرد کە چۆن کەوتووە و پەردە درووەکەی ترساندووە:

– ئەگەر وەرزشکار نەبوایەم، لەوانەبوو نەتوانم خۆم بگرمەوە و ملم بشکێ. بەڵام قەبرغەم درا بە دەستگیرەی پەنجەرەکەدا و ئازاری پێگەیشت. ڕاست ئێرەم؛ ئێشتاش کاتێک دەستی لێدەدەم ژان دەکا و واکوتراوە ڕەش و شین هەڵگەڕاوە.»

ژیان لە ماڵە تازەکەدا زۆر بە خۆشی دەستی پێکرد. بەڵام هەروەک هەمیشە ڕوو دەدا زۆر زوو بۆیان دەرکەوت ژوورێکیان کەمە و ئەگەر داهاتەکەیان پێنجسەد ڕۆبڵ زیاتر بووایە زۆر باش دەبوو. هەموو شتێک بە باشی دەچووە پێشێ و ئەوان هێندە سەرقاڵی کاروبارەکانی ماڵێ بوون کاتێک دەمەقاڵە و کێشەیەکیش ڕووی دەدا بەبێ ڕق و زیزبوون کۆتاییی پێدەهات.

کاتێک ماڵەکەیان بە تەواوی دامەزرا و ژیانیان هاتەوە سەرباری ئاسایی خۆی، دیسان لەشداگیران و یەکهاویبوونی ژیان باڵی



بەسەردا کێشانەوە. بەڵام ئەو بۆشاییەی کە تووشی ژیانیان بووبوو، بە هۆی ئەو ئاشناو ڕۆشنایانەوە کە پەیدایان کرد توانییان پڕی بکەنەوە و خۆیان لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیە ڕێک بخەن.

ئیڤانئیلیچ دانیبەیانی لە دادگا کاری دەکرد و بۆ فراوێن دەهاتەوە بۆ ماڵێ. لە سەرەتاوە زۆربەی کات ڕووخۆش و کەیفساز بوو، ئەگەرچی هێندێجار بە هۆی کەمتەرخەمی و سەرسارددییەوە کاتێک کەلوپەلی ماڵێیان دەشکاند یان خراپیان دەکرد ڕقی هەڵدەستا و تووڕە دەبوو، چونکە ئەو بۆ ڕازاندنەوە و کڕینیان زەحمەتێکی زۆری کێشابوو، بەڵام لەسەریەک لە ژیانی ڕازی بوو.

ئیڤانئیلیچ سەعات نۆی بەیانی لە خەو هەڵدەستا. قاوەی دەخواردەوە و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، پاشان جلوبەرگی لەبەر دەکرد و دەڕۆیشت بۆ دادگا. لە دادگاش زۆر بە وردی و وریاییەوە بە کارەکان ڕادەگەیشت و ڕایدەپەڕاندن. لە بەڕێوەبردنی کارەکاندا ئەوەی بیزانیبایە پەکی کارەکەیان پێدەخات یان نەزمی ئیدارەکە دەشوێنێ یان پێوەندیی بە چوارچێوەی کاروباری ئیدارەکەیانەوە نییە وەلای دەنا و نەیدەهێشت لە بەرنامەیاندا بمێنێ. زۆر بە دڵسۆزییەوە بە کاروباری کارهێنان ڕادەگەیشت و نەیدەهێشت هیچکەس بە ناهومێدی و دڵساردی بگەڕێتەوە. بۆ ماف و هەقی خەڵکی ئەوپەڕی هەوڵی دەدا و کارئاسانیی بۆ خەڵک دەکرد. لە ئاکامدا وەها بوو بە خاوەنی مرخ و ئەزموون و بە قۆناخێک گەشیت کە دەیتوانی بە زۆربەی کاروبارەکان ڕابگا. لە مەودای نێوان کۆڕەکاندا جگەرەیەکی دەکێشا، چاییەکی دەخواردەوە، هێندێک سەبارەت بە سیاسەت و مەسەلە گشتییەکان و

یاری پاپەزێن و زیاتر سەبارەت بە دامەزراندن و بردنەسەری پلەوپایەکان دەدوا. دوای تەواوبوونی کار، ماندوو بەڵام بە هەستێکی وەکوو هەستی هونەرمەندێکی شارەزاوە - هەستی کەوانژەنێکی پەنجەڕەنگین کە بەشەکەی خۆی لە ئۆرکێسترایەکدا بە وردی و بە جوانی بەڕێوە بردووە - دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ. دوای نانی نیوەڕۆ ئەگەر میوانیان نەبوایە، کتێب یان وتاری پێوەندیدار بە مەسەلەکانی ڕۆژی دەخوێندەوە و عەسرانەش بەو کارانە ڕادەگەیشت کە لە ئیدارە فریایان نەدەکەوت و دەیهێنانەوە بۆ ماڵێ. کاتێک بۆی هەڵنەدەکەوت بچێت بۆ یاریی پاپەزێن ئەو کارانە باشتر لەوە بوون لەگەڵ ژنەکەی دانیشێ. ئیڤان زۆری حەز بەو میوانییانە دەکرد کە کەسانی بەناوبانگ تێیدا بەشدارییان دەکرد. جارێکیان میوانیەکی سەمای وەڕێخست کە زۆر جوان و باش بەڕێوە چوو. باشترین کەسانی شارەکە لەوێدا بەشدارییان کرد و ئیڤان‌ئیلیچ لەگەڵ شازادەخانم پرەنسس ترووفۆنۆڤا[1]، خوشکی دامەزرێنەری بەناوبانگی ئەنجومەنی کۆمەڵایەتیی «بەرپرسایەتیی من قەبووڵ کە[2]» بوو. بەڵام دوای میواندارییەکە کە سیایی چلو پێنج ڕۆبڵی کەیک و شیرینییان بۆ هێنا و زۆری زیادی کڕیبوو، کێشە و دەمەقاڵێ هەڵگیرسا و پراسکۆڤیا مێردەکەی بە گەوج و گەلحۆ ناوبرد کە نافامێ هیچ کارێک بکات. ئیڤانیش زۆر بە تووڕەیی هەڕەشەی لێکرد کە تەڵاقی دەدا.

1 Princess Trufonova
2 Bear my Burden



گەورەترین ڕابواردن بۆ ئیڤان‌ئیلیچ یاری پاپەزێن بوو، بەتایبەت ئەو کاتانەی لەگەڵ یاریزانی باش دەیکرد، ئەویش یاریی چوارکەسی (لە یاریی پێنج کەسیدا، یەکیان زیادی بوو.) دوای یارییەکی باش کە بە دڵی بووایە بە ڕوویەکی خۆشەوە، دەچوو بۆ ژووری خەوەکەی و لە پێخەفەکەی دەخزا.

لە نێوان باشترین ئاشنا و ڕۆشناکانیدا چەند کەسێکی بۆ هامووشۆکردن هەڵبژارد. کەسانی پایەبەرز و خزمەکانیان دەهاتن بۆ سەردانیان. بەڵام بە شێوەیەکی کتوپڕ و بێ‌ئەوەی ڕاستەوخۆ دەریبڕن دۆست و خزمە هەژار و دەستتەنگاکانیان لە خۆیان تاراند.

پێتریشخۆڤی[1] گەنج، بازرەسی دادگا و کوڕی دیمیتری ئیڤانۆڤیچ پێتریشخۆڤ[2] یەکێک لەوانەبوو کە هاتوچۆی ماڵی ئیڤان‌ئیلیچی دەکرد و دڵی لیزای گرت. بەجۆرێک تەواو شەیدا و ئاشقی لیزا بووبوو. پێتریشخۆڤ تەنیا میراتگری باوکی بوو و ئیڤان و ژنەکەی زۆریان پێخۆش بوو ببێتە زاوایان. بۆیە ئیڤان‌ئیلیچ لەگە پراسکۆڤیای خێزانی کەوتە ڕاوێژ کە کارێک بکات ئەو کچ و کوڕە زیاتر لەگەڵیەک ئاشنا بن. پاشان هاتە سەرئەوەی فایتوونێکیان بۆ بگرێ بە یەکەوە سوار بن و بە نێو شاردا بگەڕێن، هەروەها هاتە سەر ئەوەی میواندارییەکی گەورەش بەو بۆنەیەوە سازبکات. ژیانی ئەوان بەم شێوەیە دەچووە پێشێ و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەدەهات، هەموو شتێکیش بەشێوەیەکی شایان و ئابڕوومەندانە دەچووە پێشێ.

1 Petrishcher
2 Dmitri Ivanovich Petrishcher

## (٤)

هەموو ساغ و سلامەت بوون و ڕۆژگار بە خۆشی و شادی تێدەپەڕی تا ئەوەی ئیڤان‌ئیلیچ تامێکی ناخۆشی لە دەمیدا هەست پێکرد و لاکەلەکەی جاروبار ژانێکی پێدا دەهات. ئەگەرچی ژانەکەی لاکەلەکەی وانەبوو کە عەجمانی لێ‌هەڵبگرێ بەلام کاتێک ژانەکەی هەست پێدەکرد گرژ و بێ‌تاقەت دەبوو و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ئەو ژان و بێ‌تاقەتییەی زیاتر دەبوو، تا وای‌لێهات کە خەریکبوو هێمنایەتیی ماڵەکە تێکبدا. کێشەی نێوان ئەو و ژنەکەی ڕۆژ نەبوو هەڵنەگیرسێ و بە دەمقرە و هەڵلا و هەنگەمە، ماڵەکە پێدا نەدەن. وردە وردە هێمنایەتیی بارگەوبنەی پێچایەوە و زۆر کەم هەڵدەکەوت بە بێ‌کێشە و دەمەقاڵێ پێکەوە دانیشن. ئێستاش پراسکۆڤیا بەڵگەیەکی باشی بە دەستەوە بوو کە بڵێ مێردەکەی کەم‌تاقەتە و پێشتریش هەروا بووە و ئەو بە ناچاری ماوەی بیست ساڵە ددان بە جەرگی خۆیدا دەگرێ و تاملی کردووە. ڕاستییەکەشی ئەوەبوو کە لەم دواییانەدا زۆربەی کێشە و دەمەقاڵێکان ئیڤان‌ئیلیچ هەڵیدەگیرساند و ڕقهەستانەکەشی هەمیشە بەر لە خواردنی شێو بەوپەڕی خۆی دەگەیشت. هێندێ‌جار بەهانەی لە قاپ و کەوچکەکان دەگرت و برێ‌جاریش ڕقی لە منداڵەکانی هەڵدەستا و زیاتریش پەلپ و بیانووی لە نان و چێشتەکە دەگرت و دەستی‌دەکرد بە گورەگوڕ و بۆ هەمووشیان پراسکۆڤیای بە خەتابار دەزانی و سەرکۆنەی دەکرد. لە سەرەتادا ژنەکەی زۆر بە توندی بە گژیدا دەهاتەوە و قسەی تاڵ و ناخۆشی پێدەگوت. بەلام



یەک دووجار کاتی خواردنی شێو بۆی دەرکەوت ئەو تووڕەبوون و دەرهەڵبوونەی دەبێ بە هۆی خواردنی نان و چێشتەکەوە بێ. بۆیە دوای ئەوە بە پەلەپەل شێوەکەی دەخوارد و واشی‌دەنواند لەبەر دڵسوزی و مێهرەبانی ئەو کارە دەکات و چاوپۆشی لە هەڵسووکەوتە توندەکانی مێردەکەی دەکات. لەلایەکی دیکەشەوە دڵی بە خۆی دەسووتا و بە ناچاری خۆی دەخواردەوە. پراسکۆڤیا خۆی بە چارەڕەش و لێقەوماو دەزانی و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دڵی لە مێردەکەی ڕەش دەبوو، تەنانەت ئاواتەخوازی مەرگی مێردەکەی بوو و زیندووبوونی ئیڤانی تەنیا لەبەر خاتری مووچەکەی دەویست و دەترسا دوای مەرگی ئەو مووچەکەی لێ‌ببڕن. ئەوەش ئەوەندەی دیکە ڕقی هەڵدەستاند. لەلایەکی دیکەشەوە دەیدی تەنانەت مردنی مێردەکەشی ناتوانێ لە دەست ئەو ئازار و چارەڕەشییە ڕزگاری بکات. بۆیە ناچار بوو ددان بە جەرگیدا بگرێ و گڕی ڕقەکەی لە ناخیدا بشارێتەوە هەر ئەو خۆخواردنەوە و ڕقەدەروونییەش ئیڤانی والێکردبوو ئەوەندەی دیکە کەم‌تاقەت و جنێگنۆکە بێ.

دوای شەڕ و دەمقڕەیەکی نێوانیان کە لەودا خەتای ئیڤان بوو، بۆ ژنەکەی ڕوون کردەوە کە هۆی قەڵس و بێ‌تاقەتبوونەکەی بە هۆی ژانی کەلەکەوەیە. پراسکۆڤیاش لە وەڵامدا گوتی ئەگەر نەخۆشی بچۆ بۆلای دوکتۆر با ماریجەت بکا.

ئیڤان چوو بۆلای دوکتۆر. هەموو شتێک هەروا ڕوویدا کە چاوەڕوانیی لێدەکرد و هەروەک هەمیشە ڕوو دەدا: دوکتۆر لووت‌بەرزانە و خۆبەزل‌زانانە پشکنینی بۆ کرد و وای‌نواند کە

پزیشکێکی چازان و پسپۆڕە؛ ڕاست وەکوو خۆی کە لە دادگا ئاوا قیافە دەگرێ و دەمار دەفرۆشێ.

دوکتۆر گوێی لە ترپەی دڵ و سییەکانی گرت و دوای هێندێ پرسیار و وەڵامی ناپێویست پزیشک وای‌نواند کە لە هەموو شتێک گەیشتووە و: «ئەگەر خۆت بدەیە دەست من چارەسەری نەخۆشییەکەت دەکەم.» بێ‌گومان هەموو شتێک ڕاست ئەوە بوو کە لە دادگا ڕوو دەدا. هەڵسووکەوتی دوکتۆر لەگەڵ ئیڤان وەکوو هەڵسووکەوتی خۆی لەگەڵ تۆمەتبارانی دادگا وابوو. دوکتۆر بۆی ڕوون کردەوە کە فلان دیاردە نیشانەی فلان نەخۆشییە و وادیارە فلان ئازار هۆکاری فلان ئەندامە و ئەگەر فلان تاقیکرنەوە نیشانی نەدا، دەبێ وای‌دانێین کە... ئەوکاتە.... بەڵام بۆ ئیڤان تەنیا یەک شت گرینگ بوو و دەیویست بزانێ نەخۆشییەکەی مەترسیدارە یان نا؟ بەڵام دوکتۆر ئەو پرسیارەی بەلاوە بێ‌بایەخ بوو و گوێی پێ‌نەدا. بە بڕوای دوکتۆر ئەو پرسیارە هیچ گرنگایەتییەکی نەبوو. ئەوەی دوکتۆر بە پشکنینی خۆی شکی بۆی دەچوو، چڵک‌کردنی گورچیلە و هەوکردنی ڕیخۆڵەکان یان ڕیخۆڵە کوێرە بوو. هیچ باسێک لە ژیان و مەرگی ئیڤان کە مەسەلەی سەرەکی بوو نەهاتە گۆڕێ. دوکتۆر لەمەڕ ڕیخۆڵەکوێرەوە بە ئاکام دەگەیشت بە شەرتێک تاقیکردنەوەی میز ئەنجام بدرێ، چونکە پێی‌وابوو لەوانەیە دیاردەیەکی تازەی وەدەست بکەوێ و وای بەباش زانی جارێکی‌تر پشکنینی بۆ بکاتەوە. ئەوانەش ڕاست وەکوو ئەو کارانە وابوو کە ئیڤان کاتی بەرەورووبوون لەگەڵ خەڵک لە دادگا هەزاران جار بە شێوەیەکی شارەزایانە ئەنجامی دابوو.



دوکتۆر زۆر زیرەکانە لە سەروو چاویلکەکەیەوە چاوی لە چاوی ئیڤان بڕی و بە کورتی ئاکامی پشکنینەکەی خۆی پێگوت. ئیڤان بە بیستنی قسەکانی دوکتۆر بەو ئاکامە گەیشت کە نەخۆشییەکەی زۆر قورس و مەترسیدارە، بەڵام بۆ دوکتۆر و ڕەنگە بۆ هەرکەسێکی دیکەش مەسەلەکە هیچ گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو. ناسینی نەخۆشییەکەی و مەترسیداربوونی زەبرێکی کاریگەر بوو کە وای‌لێکرد زۆری بەزەیی بە خۆیدا بێت و لە داخی ئەو بێ‌تەفاوەتییەی دوکتۆریش ڕقێکی ئەستوور ناخی داگرتبوو. هیچی نەگوت. هەستا، پارەی ویزیتی دوکتۆری لەسەر مێزەکە دانا، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

– ئێمە نەخۆشەکان ڕەنگە زۆرجار پرسیاری بێ‌جێ بکەین. بەڵام پێم‌بڵێ، ئەو نەخۆشییەی من مەترسیدارە یان نا؟...

دوکتۆر بە چاوێک لە سەروو چاویلکەکەیەوە لێی‌ڕووانی، وەک ئەوەی بڵێ: «زیندانی! ئەگەر بتهەوێ وەڵامی نابەجێ بدەیەوە ناچار دەبم لە دادگا بتکەمە دەرێ.»

هەرواش بوو و دوکتۆر گوتی:

– من ئەوەی پێویست بوو گوتم. تاقیکردنەوەکان ڕەنگە شتی زیاتر نیشان بدەن.

ئیڤان لە سەرەخۆ ڕۆیشتە دەرێ. بە خەمبارییەوە سواری عارەبانە بوو و ڕۆیشتەوە بەرەو ماڵێ. لە ماوەی ڕێگادا ئەوەی دوکتۆر گوتبووی لە مێشکیدا لێکی‌دایەوە. هەوڵی‌دا ڕستە دژوار و زانستییەکان بە زمانێکی سادە وەرگێڕێتەوە و لە نێوان ئەواندا

وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزێتەوە: «حاڵی من زۆر خراپە؟ زۆر خراپە؟ یان هێشتا مەترسییەک لە گۆڕێدا نییە؟» لە واتای قسەکانی دوکتۆر واتێگەیشت کە تووشی نەخۆشییەکی زۆر مەترسیدار بووە. کە بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت هەموو شتێکی خراپی بە مێشکدا دەهات. عارەبانەچییەکان، ماڵەکان، خەڵک و دووکانەکان هەموویان خەم و پەژارەیان پێوە دیاربوو.

ژان و ئازارەکەی بۆ ساتێک هێدی نەدەبوو و حەجمانی لێهەڵگرتبوو، بە قسە گوماناوییەکانی دوکتۆریشدا واتایەکی تازە و بنەوەشی دۆزێبۆوە.

گەیشتەوە ماڵێ و سەبارەت بە چوونی بۆلای دوکتۆر و قسە و پشکنینەکانی لەگەڵ خێزانی قسەی کرد. ژنەکەی گوێی بۆ گرت، بەڵام لە نیوەی قسەکانیدا کچەکەی بە کڵاوەوە خۆی کرد بە ژووریدا تاکوو لەگەڵ دایکی بچنە دەرێ. بە دیتنی حاڵی خراپی باوکی و ناخۆشیی بارودۆخەکە نابەدڵانە دانیشت و گوێی بۆ قسەی خەفەتهێنەری باوکی ڕاگرت، بەڵام تاقەتی نەهێنا و ئەمپاو ئەوپای دەکرد تاکوو بەجۆرێک خۆی لەو تەنگژەیە دەرباز بکات. لەوکاتەدا دایکیشی کە دەستەکەمێکی لەو نەبوو گوتی:

– زۆرچاکە، زۆر خۆشحاڵم، ئاگاداربە دەواکانت لە کاتی خۆیدا بخۆی. ڕاچێتەکەم دەیە با بیدەم بە گراسیم بچێ لە دەواخانە دەواکانت بۆ بێنێ.

پاشان ژوورەکەی بەجێ هێشت تاکوو بۆ چوونەدەرێ خۆی ئامادە بکات. پراسکۆڤیا کە لە ژوورەکە چووە دەرێ، ئیڤان



هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بیری کردەوە: «زۆر چاکە، ڕەنگە نەخۆشییەکەم زۆریش مەترسیدار نەبێ.»

ئیڤان دەستیکرد بە خواردنی دەوا و بەڕێوەبردنی دەستووری پزیشک کە دوای تاقیکردنەوەی میزەکەی بۆی گۆڕیبوو. بەڵام دواتر لە نێوان ئەو نیشانانەی لە تاقیکرنەوەکەدا دەرکەوتبوون و ئەو دیاردانەی بە شێوەی جۆراوجۆر خۆیان دەنواند وێکنەچوونێک وەیار کەوت. ئەم وێکنەچوونانە دەریخست کە جیاوازیی ئەوەی ڕوویداوە لەگەڵ قسەکانی دوکتۆر دەبێ بەو هۆیەوە بێ کە دوکتۆر یان هەڵەی کردووە یان شتێکی لە بیر چووە، یان لەوانەیە شتێکی لە ئەو شاردبێتەوە. هەرچۆنێک بێ دوکتۆر بەرلۆمە نەبوو و ئیڤان هەروا گوێڕایەڵانە و بە شەرت و مەرج دەستوورەکانی بەڕێوە دەبرد و سەرەتا بەو کارە هەستی بە هێمنایەتی دەکرد.

لە کاتی پشکنینی پزیشکەوە، کاری سەرەکیی ئیڤان ئەوەبوو کە دەستووری دوکتۆر مووبەموو جێبەجێ بکات، واتە پاکوخاوێنی بپارێزێ و لە هێندێ خواردن پارێز بکات و دەواکان لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا بخوات و لە کاتی ئازارەکەشدا چبکات. نەخۆشی و لەشساغیی خەڵک سەرنجی ئیڤانی ڕادەکێشا. کاتێک لەلای ئەو باسی نەخۆشی، مەرگ یان سڵامەتیی کەسێکیان دەکرد، بەتایبەت کاتێک باسی نەخۆشییەکی وەک نەخۆشییەکەی ئەو دەهاتە گۆڕێ، بە دڵەخورپەیەکی زۆرەوە کە هەوڵی دەدا بیشارێتەوە بە وردی گوێی ڕادەگرت و پرسیاری دەکرد و ئەوەی دەیبیست لەگەڵ بارودۆخی خۆی هەڵیدەسەنگاند.

ژان و ئازارەکەی کەمتر نەبۆوە بەڵام ئیڤان هەوڵیدا بەخۆی بسەلمێنێ کە حاڵی باشتر بووە. لە کاتێکدا هێمنایەتی باڵی بەسەر ماڵەکەدا دەکێشا یان بە تەنیا دەبوو هەستی بە چاکبوونەوە دەکرد، بەڵام لەگەڵ سازبوونی چکۆلەترین کێشە و دەمەقاڵێ لەگەڵ خێزانی، بە دەستەوە نەهاتنی کارێکی دایرەکەی یان دۆڕاندنی یاریی پاپەزێن، لەڕێوە ژان و نەخۆشییەکەی خۆی وەبیر دەهاتەوە و ئازارێکی قورس ئاراوقارای لێهەڵدەگرت. ئەو پێشتریش لەگەڵ ئەو چارەڕەشییانە بەرەوڕوو بووبوو، بەڵام هەمیشە هیوادار بوو کێشە و ئاڵۆزییەکان چارەسەر بکات و بە سەریاندا زاڵ بێ و کارێک بکات ئەو شکست و ئاڵۆزییانە ببنە سەرکەوتن و هێمنایەتی. بەڵام ئێستا چارەڕەشی ئەوی تووشی فەرتەنە و گێژاوی بەدبەختی کردبوو. بەخۆی دەگوت: «خەریک بوو وردە وردە چاک دەبوومەوە و دەواکان کاریگەرییان دەبوو کە ئەو ناوچاوانە ڕەش و نەگبەتەم، یان ئەم گرفتارییە دیسان بەرۆکی گرتم...»

بە هەموو ڕووداوێکی ناخۆش دەرهەڵدەبوو و ڕقی لەو خەڵکە هەڵدەستا کە بووبوونە هۆی خەم و دڵتەنگییەکەی. هەستی دەکرد ئەم ڕقە دەیکووژێ، بەڵام نەیدەتوانی ددان بە خۆیدا بگرێ. بە ئاشکرا دیاربوو ئەو ڕقهەستان و پیشخواردنەوانەی کە بە هۆی هەڵسووکەوتی خەڵکەوە بوو، نەخۆشییەکەی لێقورستر دەکا و دەبوو لە هەمبەریاندا خۆڕاگری بکات و بەسەر ڕق و قینی خۆیدا زاڵ بێت، بەڵام نەیدەتوانی. خوێندنەوەی کتێبی زانستی پریشکی و ڕاوێژکردن لەگەڵ پزیشکەکان ئەوەندەی دیکە ورەی دابەزاند و



ڕەگاژۆی بە نەخۆشییەکەی کرد. نەخۆشییەکەی هێندە لەسەرەخۆ خەریکی ڕیشە داکوتان بوو کە کاتێک لەگەڵ ڕۆژەکانیتر هەڵیدەسەنگاند جاری وابوو خۆی فریو دەدا و پێیوابوو حاڵی باشترە. چونکە ئەمڕۆی لەگەڵ دوێنێی جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو. بەڵام کاتێک لەگەڵ دوکتۆرەکان ڕاوێژی دەکرد بۆی دەردەکەوت کە نەخۆشینەکەی قورستر بووە و تەنانەت زۆر بە توندیش خەریکی تەنەوەکردنە. بۆیە هەمیشە لەگەڵ دوکتۆرەکان خەریکی ڕاوێژکردن بوو بەڵکوو یەکیان بتوانێ بۆ چاکبوونەوە و لەشساغی هیواداری بکاتەوە.

لەو مانگەدا چوو بۆلای پزیشکێکی بەناوبانگیتر و لەگەڵ ئەویش ئەو پرسیارانەی پزیشکەکەی پێشووی بە هێندێ جیاوازییەوە هێنایەگۆڕێ. بەڵام ڕاوێژ و قسەکردن لەگەڵ ئەو دوکتۆرەش تەنیا شک و گومانی لە دڵیدا زیاد کرد. یەکێک لە دۆستانی ئیڤان ئاشنایەکی بوو کە زۆر دوکتۆرێکی باش بوو. چوون بۆلای ئەویش، بەڵام پێیوابوو نەخۆشییەکەی تەواو لەگەڵ تەشخیسی دوکتۆرەکانیتر جیاوازە و لەگەڵ ئەوەی گوتی چاکی دەکاتەوە و سلامەتیی پێدەبەخشێتەوە، پرسیار و بۆچوونەکانی ئەوەندەیتر گومان و ترسی خستە دڵی ئیڤانەوە.

پسپۆڕێکی هۆمۆیۆپاتیست[1] نەخۆشییەکەی ئەوی بە شتێکی دیکە زانی و هێندێ دەوای بۆ نووسی کە ئیڤان ماوەی حەوتوویەک بە

1 Homoeopathist

شێوەی نهێنی و لە کاتی خۆیدا دەیخواردن. بەڵام دوای حەوتوویەک چاک نەبۆوە هیچ، خراپتریش بوو. لە هەموو دوکتۆرەکان هیوابڕاو بوو و ئیمانی پێیان نەما. ڕۆژێک ژنێکی ئاشنایان ئاماژەی بە شیفابەخش بوونی وێنەی پیرۆز کرد و گوتی کە پەرجۆیەکی وا ڕوویداوە و بە چاوی خۆی دیتوویە نەخۆشی سەرەمەرگی پێچاک بۆتەوە. ئیڤان قسەی ئەو ژنە کاری تێکرد و دیتی بە وردی گوێی بۆ ژنە شل کردووە. لە ناکاو وەخۆ هاتەوە: «مێشکی من تا ئەو ڕادەیە لاواز بووە و خەرەفاوم؟ بەڕاستی گەوجانەیە پیاو باوەڕ بە شتیوا بکات. ئەو قسانە هەموو قۆڕیاتە و نابێ خۆم بدەمە دەست ترس، دەبێ دوکتۆرێکی باش و پسپۆڕ پەیداکەم. تەنیا ڕێگا ئەوەیە و نابێ گوێ بە قسەی پڕوپیرێژنانە بدەم. ئێستا هەمووشتێک ئاشکرایە و نابێ بیری لێبکەمەوە. بەڵام هەتا هاوینێ ئەو دەواو دەرمانانە دەخۆم و پاشان ئاکامەکەی دیاری دەدا. لە ئێستاوە ئیتر نابێ دوودڵ بم.»

ئەمە بە قسە ئاسان بوو بەڵام لە ڕاستیدا مەحاڵ بوو. تامی ناخۆشی دەمی لەگەڵ ئازاری تاقەتبڕ زۆر سەیر و سەرسووڕهێنەر بوون. هەستی کرد هەناسەی بۆنێکی زۆر پیس و قێزەونی لێدێ و ئیشتیای کەم بۆتەوە و خەریکە لاواز و بێهێز دەبێ. هیچ ڕێگایەک بۆ فریودانی خۆی نەمابوو: ڕووداوێکی تازە و ترسناک خەریکبوو لە ناخیدا دەقەوما کە تەنیا خۆی لێیئاگادار بوو. دەوربەرییەکانی لێیتێنەدەگەیشتن و هەموو شتێکیان ئاسایی دەهاتە بەرچاو. ئەوەش لە هەموو شتێک زیاتری ئیڤانئیلیچ ئازار دەدا.



بنەماڵەکەی، بەتایبەت ژن و کچەکەی دایمە سەرقاڵی بەزم و میوانداری و چوونە میوانی بوون و ئاگایان لەو نەبوو کە چۆن خەریکە لە ناخەوە دەپووکێتەوە. ئەوان کە دەیاندی ئیڤان خەمبارە و زوو دەرهەڵدەبێ، لێیدەرەنجان و بۆ ئەو ئاکارانە سەرکۆنەیان دەکرد. ئەگەرچی ئەوان دەیانویست ئەو ئاکارانەیان بشارنەوە و بە ئاشکرا دەرینەبڕن، بەڵام ئیڤان دەیزانی چۆن لە ناخەوە ڕقیان لێیەتی و بە کۆسپ و لەمپەری سەرڕێی خۆیانی دەزانن. هاوسەرەکەی ئیتر زۆر کەمتەرخەم و سەرسارد خۆی دەنواند و بێئەوەی گوێ بە قسە و ئاکاری مێردەکەی بدات بێدەنگ سەری دادەخست و خەریکی ئیشی خۆی دەبوو.

پراسکۆڤیا بە دۆستەکانیانی دەگوت:

– خۆ دەزانن ئاکاری ئیڤان لەگەڵ تەواوی خەڵک جیاوازە. ئەو دەستوورەکانی پزیشک لە گوێ ناگرێ. ڕۆژێک دەواکانی دەخوا و دوو ڕۆژ نایخوا و ئەو پارێزانەی دوکتۆر پێیگوتووە ڕایان ناگرێ و لەکاتی خۆیدا ناخەوێ. گۆشتی سەگماسی دوکتۆر لێی قەدەغە کردووە کەچی دەیخوات. دەبێ ڕۆژی هەشت سەعات بخەوێ کەچی جاریوایە هەتا سەعات یەکی شەوێ خەریکی یاریی پاپەزێنە.

ئیڤان بە دڵتەنگییەوە وەڵامی دەدایەوە:

– کەی وابووە؟ تەنیا جارێک لە ماڵی پیتێر ئیڤانۆڤیچ...

پراسکۆڤیا قسەکەی پێدەبڕێ:

– دوێنێ شەویش لەگەڵ شەبەک.

ئیڤان قەبوولی دەکات و دەڵێ:

– زۆرچاکە وایە، بەڵام من ئەگەر بشمهەوێ بخەوم خۆ ئەو ژانە ناهێڵێ خەو بچێتە چاوم.

پراسکۆڤیا بە تووڕەیی دەڵێ:

– فەرق ناکا، تۆ تازە قەت وەک ڕابردوو تەندرووستی وەدەست ناهێنیتەوە و ئێمەشت بە خۆتەوە بەدبەخت کردووە. ئارامت لێهەڵگرتووین.

هەڵسوکەوتی پراسکۆڤیا فیۆدۆرۆنا لەگەڵ نەخۆشینی مێردەکەی، هەروەک بەئاشکرا بەهەموان و تەنانەت بە ئەویشی دەگوت ئەمە بوو کە داخی ئەو نەخۆشینەی لە دڵی ئەو دایە و ژانێکە هەتا سەر یەسقانی ڕیشەی داکوتاوە، ئەوەش هیچ نییە جگە لە بیانوویەک کە مێردەکەی بۆ گیانی ئەوی سازکردووە. ئیڤان ئیلیچ هەستی دەکرد ژنەکەی هیچی لەدڵدا نییە و ئەو قسانە نەخوازراوانە لەزاری دەردەپەڕن، بەڵام ئەو خەیاڵانەش باری لەسەر دڵی سووک نەدەکرد و ئۆخژنی پێنەدەبەخشی.

ئیڤان ئیلیچ بەئاشکرا  دەیدی لە دادگاش بە چاوی کەسێک لێی دەڕوانن کە بەم زووانە دەبێ تەشریف بەرێ و بەرچاویان چۆڵ بکات. دۆست و هاوکارەکانی بە کینایە باسی دابەزینی ورەی ئەویان دەکرد. دەتگوت نەخۆشی و ئازارکێشانی و ئەو شتە ترسناک و نەخسەی کە لە ناخیدا هێلانەی چێ کردووە و خەریکە شیلەی گیانی دەمژێ، بۆتە بابەتێکی باش و شیاو بۆ گاڵتە و ڕابواردنی دۆست و هاوکارەکانی. لە هەمووی پڕئازارتر زمانی تەڕ و قسە



گاڵتەجاڕییەکانی شوارتێز بوو کە ئیڤانی وەبیری دە ساڵ لەمەوبەر دەخستەوە.

هاوڕێیانی یاریی پاپەزێنیان سازکرد و هەموو لە دەوری یەکتر کۆ بوونەوە. دەوری یەکەمی یارییەکە بە نووشتاندنەوە یان نەرمکردنی پەڕەکان دەستیپێکرد. یارییەکی خۆشبوو و ئیڤان جارێکیتر شارەزاییی خۆی لەو یارییەدا نواند، بەڵام لە ناکاو ژانەکەی دەستیپێکرد و چێژی ئەو یارییە خۆشەی لێتاڵ کرد. چاوێکی لە هاویارییەکەی، میخاییل میخائیلۆڤیچ[1] کرد کە بە دەستە بەهێزەکەی بە ئارامی لە مێزەکەی دەدا و لەجیاتی ئەوەی پەڕەکان هەڵگرێ بە هێواشی ڕایدەدان بۆ بەردەمی ئیڤان تاکوو بتوانێ بەبێ خۆ زەحمەتدان و دەستدرێژکردن، کۆیان بکاتەوە. ئێوان لە دڵی خۆیدا گوتی: «پێیوایە من هێندە لاواز بووم ناتوانم دەست بکێشم بۆ پەڕەکانیش.» لە داخانا گێژ و کاس دەبێت و بە دەرخستنی پەڕێکی نابەجێ ئەو و بەرامبەرەکەی دەیدۆڕێنن. بەو دۆڕاندنە میخائیل میخائیلۆڤیچ زۆر دڵگران دەبێ بەڵام دڵگرانی و تووڕەبوونەکەی دەشارێتەوە.

هەموو بۆیان دەردەکەوێ کە هاوڕێکەیان ئازار دەکێشێ بۆیە گوتیان:

– ئەگەر ماندووبووی و ناتوانی با یاری نەکەین، تۆزێ پشوو بدە.

1 Mikhail Mikhaylovich

پشوو دان؟ نا، ئەو ماندوویی لەزاتیدا نەبوو، هەتا کوتایی درێژەی بە یارییەکە دا. هەموویان مرومۆچ بوون و زمانیان نەدەگەڕا. ئیڤان ئیلیچ دەیزانی هۆکاری ئەو ماتی و بێتاقەتییەی هاوڕێکانی خۆیەتی، بەڵام نەیدەتوانی بەنەشەیان بهێنێ. میوانەکان شێویان دەخوارد و دەڕۆیشتن، ئەو بەتەنیا دەمایەوە و بەباشیش دەیزانی ژیانی لێتاڵ بووە و ژیانی لە دەوروبەرییەکانیشی تاڵ کردووە. ئەو ژەهرەی کە گیانی داگرتووە و خەریکە لەناوی دەبا قەت بەرۆکی بەرنادات و بەپێچەوانە ڕۆژلەگەڵ ڕۆژ زیاتر لەناخیدا ڕەگاژۆ دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستێکیتری یاری کرد. هەموو خەمبار و بێدەنگ بوون. ئیڤان ئیلیچ هەستی کرد کە ئەو یارییە خۆشەکەی ئەوانی تێکداوە بەڵام چاری ناچار بوو.

ئەو دەبوو لەگەڵ ئەو هەموو ژان و ئازار و ترسەی کە دڵی داگرتووە بخزێتە نێو پێخەفەکەیەوە. ئەو شەوانە زۆر زۆری ئازار دەکێشا و لەبەر ژانی لاکەلەکەی جینگڵی دەدا، بەیانیش دەبوو بە خەمباری و لەشداگیراوی خۆی ئامادە بکات و بچێت بۆ دادگا. لەوێش دەبوو قسە بکات و بنووسێ. چونکە ئەگەر نەچووبایە بۆ دادگا دەبوو لە ماڵەوە لەگەڵ ئازارەکانی دەست بەیەخە بێت و ددان بەجەرگی خۆیدا بگرێ. لە دادگا زۆر بێخەمتر و باشتری بۆ دەگوزەرا، چونکە لەوێ لانیکەم لە پرتەوبۆڵەی خێزانی بەدوور بوو.



## (٥)

بەم شێوەیە مانگێک دوو مانگ تێپەڕی. ڕاست بەر لە ساڵی نوێ براکەی پراسکۆڤیا هات بۆ شار و لە ماڵی ئیڤانئیلیچ نیشتەجێ بوو. کاتێک هات ئیڤان لە دادگا بوو و هاوسەرەکەشی چووبوو بۆ کڕینی کەلوپەلی ماڵێ لە نێو بازار. کاتێک ئیڤان هاتەوە بۆ ماڵێ و چووە ژووری متالاکردن، چاوی بە ژنبراکەی کەوت ـ پیاوێکی بەهێز و تێکسمڕاوـ خەرکی کردنەوەی جانتاکەی بوو. کە ترپەی پێی ئیوانی بیست سەری هەڵێنا و بەبێ ئەوەی زمانی بگەڕێ بۆ ساتێک چاوی تێبڕی. هەڵبەت ئەو ڕوانینە پڕ لە سەرسووڕمانە پێویستی بە قسە نەبوو و نیشاندەری بارودۆخی جەستەیی ئیڤان بوو. ئەو بە جوانی لە مانای ئەو ڕوانینە پڕ لە بێدەنگییەی ژنبراکەی گەیشت و لێیپرسی:

– چییە زۆر گۆڕاوم؟

– بەڵێ زۆر گۆڕاوی.

پراسکۆڤیا هاتەوە بۆ ماڵێ و براکەی بۆ دیتنی خوشکی لە ژوورەکە چووە دەرێ. ئیڤان دەرگاکەی داخست و لەبەر ئاوێنەکە سەرەتا چاوی لە هەموو دەموچاوی خۆی کرد، پاشان لە لاجانگی خۆی ڕوانی و تێیڕاما. ئەو وێنەیەی کە لەگەڵ هاوسەرەکەی گرتبووی، هەڵیگرت و لەگەڵ ئەوەی لە نێو ئاوێنەکەدا بوو هەڵیسەنگاند. گۆڕانەکە زۆر و لەڕادەبەدەر بوو. قۆڵی هەتا هەنیشکی هەڵکرد و چاوی لە قۆڵ و مەچەکی خۆی کرد. پاشان هەستیکرد سەری لە گێژەوە دێ و خەم دڵی ڕێکگوشی، بۆیە قۆڵی دادایەوە و بە دڵێکی پڕ لە کەسەرەوە لەسەر کورسیلەیەک دانیشت.

بەخۆی گوت: «نا نا، نابێ هیوابڕاو بم.» لە جێی خۆی ڕاپەڕی و چوو بۆلای مێزەکە. چەند دەقی سکاڵاو گازندەی لە پەروەندەیەک دەرهێنا و دەستیکرد بە خوێندنەوەی بەڵام نەیتوانی بە تەواوی بیانخوێنێتەوە، هەستا دەرگاکەی کردەوە و ڕۆیشت بۆ ژووری میوانداری. دەرگای ژووری میوانداری پێوەدرابوو. بە پێدزکە لە دەرگاکە نزیک بۆوە و گوێی پێوەنا.

پراسکۆڤیا دەیگوت: نا تۆ باشت نەدیوە، یەکجار ئاواش نییە، تۆ زێدەڕەوی دەکەی.

براکەی وەڵامی دایەوە: زێدەڕەوی! ئەو ڕەنگی مردووی لێنیشتووە. تۆ چاو لە چاوی بکە! تەمی لێنیشتووە و ترووسکەی تێدا نەماوە. وا زەرد هەڵگەڕاوە دەڵێی مردووە. باشە بۆ وای لێهاتووە؟

پراسکۆڤیا گوتی: هیچکەس نازانێ. دوکتۆرەکەی واتە نیکۆلائیڤیچ[1] شتێک دەڵێ. لێچتیتسکی[2] کە دوکتۆرێکی دیکەیە تەشخیسەکەی زۆر لەگەڵ ئەو جیاوازە. منیش بەجارێ گێژ بووم...

ئیڤان لە دەرگاکە دوور کەوتەوە. ڕۆیشتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، ڕاکشا و خەیاڵ هەڵیگرت: «گورچیلە، هەوکردنی گورچیلە.» هەموو ئەو قسانەی دوکتۆرەکان کردبوویان سەبارەت بە گورچیلەی وەبیری هاتەوە. دەبێ کارێک بکات گورچیلەی وەکار بکەوێتە و بەهێزی بکات، بەڵام چۆن؟ بە قسە لە کارێکی ئاسان دەچێ. «نا، دەبێ بچم دیسان چاوم بە پیتێر ئیڤانۆڤیچ بکەوێ و پێکەوە بچین بۆلای دۆستە پزیشکەکەی.»

---

1 Nicolayivich
2 Lechtitsky



زەنگی لێدا و عارەبانەیان بۆ ئامادە کرد. ویستی بڕواتە دەرێ. ژنەکەی بە دڵتەنگییەوە لێی‌پرسی:

– خۆشەویستەکەم، بۆ کوێ دەچی؟

ئیڤان بە ڕوویەکی ناخۆشەوە چاوی لە چاوی بڕی و گوتی:

– دەبێ بچم بۆلای پیتێر ئیڤانۆڤیچ.

لە سەرسەرا چووە خوارێ سواری عارەبانە بوو و ڕۆیشت بۆ ماڵی پیتێر ئیڤانۆڤیچ. لە ماڵی پیتێر ماوەیەک دانیشتن قسەیان کرد و پاشان پێکەوە چوون بۆلای دوکتورەکە. ئیڤان ماوەیەک لەگەڵ دوکتۆر قسەی کرد و هێندێ زانیاریی وەدەست هێنا.

شتێک، شتێکی چکۆلە لە ڕیخۆڵە کوێرەیدا بوو و دوکتۆرەکان دەیانویست ماریجەی بکەن و جگە لە تامڵکردن و دان بەخۆداگرتن هیچ کارێکی دیکەی لە دەست نەدەهات. بۆ شێو درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵێ، شێوی خوارد و لەگەڵ هەمووان قسەی کرد. وێدەچوو ژانی نەبێ. پاشان چوو بۆ ژووری کارەکەی بەڵام هەستی کرد شتێکی لە بیر چووە. بە خۆی گوت: «بەڵێ، ڕیخۆڵە کوێرەی شێوە کرم.» بەڵام هەوڵیدا لە بیری خۆی بەرێتەوە و بۆ خواردنی چایی ڕۆیشتەوە بۆ ژووری میوانداری.

لە ژووری میوانداری دەنگە دەنگ و ژاوەژاو دەهات. کە چووە ژوورێ میوانیان هەبوو. بازڕەسی دادگا، دەزگیرانی داهاتووی کچەکەشی لەگەڵ میوانەکان بوو. میوانییەکی خۆش بوو، مۆسیقا و گۆرانی و پێکەنین و شادی ژوورەکەی داگرتبوو.

ئیڤانئیلیچ سەعات یازدە شەوباشی پێگوتن و ڕۆیشت بۆ ژووری خەوەکەی. لەوکاتەوە نەخۆش کەوتبوو لە ژوورێکی چکۆلەی پەنا ژووری

کارەکەی دەخەوت. جلی خەوی لەبەر کرد، ڕۆمانێکی ئیمیل‌زۆلای بە دەستەوە گرت و خۆی بۆ خەوتن ئامادە کرد. ڕۆمانەکەی لێککردەوە بەڵام بەجێی خوێندنەوە خەیاڵ هەڵیگرت. لە خەیاڵیدا ڕیخۆڵە کوێرەی ماریجە کرابوو و گورچیلەی بە شێوەیەکی ئاسایی کەوتبۆوە کار. «بەڵێ دەکرێ، بەڵام...» دەواکانی وەبیر هاتەوە. هەستا پەرداخێکی ئاو هێنا و دەواکانی خوارد، لەسەر پشت ڕاکشا و چاوەڕوانی کاریگەریی دەواکە بوو. «دەبێ دەواکان بەردەوام و لە کاتی خۆیدا بخۆم و ئەو شتانەی بۆ تەندروستیم زیانبارن پارێزیان لێبکەم. هەر ئێستا باشتر بووم، زۆر باشتر.» دەستی بە لاکەلەکەی خۆیدا هێنا. کە دەستی پێدا هێنا هەستی بە هیچ ژانێک نەکرد. بەخۆی گوت: «هەر بەڕاستی هەست بە هیچ ژانێک ناکەم. وادیارە چاک بوومەتەوە.» چراکەی کووژاندەوە و کەوتە سەرلاتەنیشت. لە ناکاو ژانەکەی لاکەلەکەی سەری‌هەڵدایەوە و تامە ناخۆش و قێزەونەکەی لە دەمیدا هەست پێکرد. لەپڕ دڵی داچڵەکی و خەمێکی قورس سەرتاپای داگرت و تاسا. لە ژێر لێوەوە گوتی: «خودایەگیان! خودایەگیان! ئەو ژانەم لەکۆڵ ناکەوێ، ئەو ئازار و نەخۆشییە ماریجەی نایە. وادیارە ئەو ڕیخۆڵەکوێرە شێوە کرمە خەریکە بە شێوەیەکی جیاواز و نائاسایی تەنەوە دەکا. گورچیلە! خۆ مەسەلەی گورچیلە و ڕیخۆڵەکوێرە نییە، مەسەلەی مەرگ و ژیان لەگۆڕێدایە. ئەرێ، خەریکە ژیانم وردە وردە بەرەو فەوتان دەڕوا و ئەم جۆگەلەیە خەریکە بەرەو زەلکاوی مەرگ دەخوشێ و من ناتوانم بەری‌بگرم. بۆ خۆم هەڵخەڵەتێنم؟ مەرگم بۆ هەموو کەس ڕوون و ئاشکرایە جگە لە خۆم. مردنی من یەکجارییە و تازە چاکبوونەوەم مەحاڵە، بەڵام کاتی مردنەکە



نادیارە، چەند حەوتوو، چەند ڕۆژ، یان ڕەنگە هەر لەم مانگەدا بێ. پێشتر لە نێو ژیان و ڕووناکیدا بووم بەڵام ئێستا مەرگ و تاریکی خەریکە هەڵمدەلووشێ. تا ئێستا لێرە بووم و وادیارە دەبێ بڕۆم بۆ جێگایەکی‌تر بەڵام بۆکوێ؟»

ئارەقەیەکی سارد نیشتە سەرتەوێڵی، هەناسەی ڕاوەستا و دڵی بە شێوەیەکی ترسناک کەوتە کوتەکوت.

«کاتێک لێرەنیم لە کوێ دەبم؟ ئەوێ چ جۆرە شوێنێکە؟ نا! من نامەوێ بمرم!»

هەستا. ویستی مۆمێک داگیرسێنێ، بەڵام بە هۆی لەرزینی دەستەکانییەوە شەمدانەکەی لە دەست کەوتە خوارێ. لەسەر تەختەکەی ڕاکشایەوە. چاوی لە تاریکیی بن‌میچەکە بڕی و بە خۆی گوت: «جا ئەو ژیانە بەکەڵکی چی دێ؟ جیاوازیی چییە؟ مەرگ، بۆ من مەرگ و ژیان وەکیەک وایە. خەریکی بەزمو ڕەزمی خۆیانن، خۆ هیچکەس لە بیری مندا نییە.» (دەنگی گۆرانی لە ژووری میواندارییەوە دێت و چەند دەنگی‌تر کە گۆرانییەکەی لەگەڵ دەڵێنەوە.)

«بۆ ئەوان هیچ گرنگایەتییەکی نییە. بەڵام ئەوانیش دەمرن! گەمژانە! سەرەتا من دەمرم، ئەوانیش هێندێک درەنگتر. بەڵام بۆ ئەوان هیچ گرنکییەکی نییە و ئێستا شاد و خۆشحاڵن... دڵیان خۆشە و خەریکی بەزمی خۆیانن.... بەڕاستی کارەکەیان گەوجانەیە.»

هەناسەی سوار بووبوو لەوانەبوو بخنکێ. بێ‌هێز و توانا لێ‌بڕاو جینگڵی لە خۆی دەدا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ناکرێ هەموو خەڵک بەوە

مەحکووم بن کە ئەم ترسە و ئەم ئازارە تاقەتپڕووکێنە تامڵ بکەن.» زۆر بە زەحمەت هەستا.

«دەبێ هەڵەیەک ڕووی دابێ. دەبێ بە هێمنایەتی لە سەرەتاوە بە هەموو شتەکاندا بێمەوە. بەڵێ، لاکەلەکەم زەبری وێکەوت بەڵام هەر ئەو ڕۆژە، تۆزێ ژانی کرد، بۆ ڕۆژی دوایی عەلەمی لێبڕا. ماوەیەک دوای ئەوە تۆزە ژانێکی جاروبار بە لاکەلەکەمدا دەهات، تا وایلێهات وردە وردە ژانەکە زیادی کرد. چەند دوکتۆر بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەم پشکنینیان بۆ کردم. زۆرم دوکتۆراو دوکتۆر کرد، بەڵام وزە و هێزی جەستەم دابەزی و لەو گێژاوە نزیک و نزیکتر بوومەوە و ئێستا چاوانم تروسکەیان تێدا نەماوە و خەریکە بەرەبەرە لە نێو دەچم. بیر لە ڕیخۆڵەکوێرەم دەکەمەوە؛ بەڵام ئەوە مەرگە! بیر لە دەوای ڕیخۆڵەکوێرە دەکەمەوە، لە کاتێکدا مەرگم لێنزیکە. یانی ئەمە دەتوانێ بەڕاستی مەرگ بێ؟»

جارێکیتر ترس بە سەریدا زاڵ بوو و کەوتە هەناسەبڕکێ، دانەوی و خەریکبوو لە شقارتە دەگەڕا، مێزی لای چرپاکەشی کەوت بەلادا چونکە دەستی پێوەگرتبوو و هێزی خۆی دابووە سەری. بە بێهێزی و ناهومێدی لەسەر قەرەوێڵەکە خۆی تخێڵ کرد و چاوەڕوانما تاکوو مەرگ بە زووترین کات بگاتە سەری و حەیاتی لێببڕێ.

لەو کاتەدا میوانەکان ڕۆیشتن و پراسکۆڤیا کە میوانەکانی بەڕێکرد، گوێی لە زرمەی کەوتنی شتێک بوو و خۆی کرد بە ژوورەکەی ئیڤاندا.

– چیبووە ئیڤان؟

– هیچ نییە. نەمزانی خۆم لە مێزەکەدا و کەوت بەلادا.



پراسکۆڤیا چووە دەرێ و بە مۆمێکەوە گەڕایەوە. ئیڤان وەک کەسێک کە چەندین کیلۆمەتر هەڵاتبێ کەوتبووە هەناسەبڕکێ و بێدەنگ و مات لە ژنەکەی دەڕوانی و چاوی نەدەتروکاند.

– چی بووە؟

– هی...چ. مێزەکەم خست.

لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «بۆ باسی ترس و ئازاری خۆم بکەم؟ خۆ ئەو نە دڵی دادەچڵەکێ و نە ئەوەیە پێمەوە هیلاک بێت، نە تێدەگات.»

– دەزانیچی ئیڤان، پێموایە داوا لە لێشچێتیسکی بکەین بێت و جارێکیتر پشکنینت بۆ بکات. پراسکۆڤیا سەری لەقاند و دانیشت.

بانگکردنی ئەو دوکتۆرە پسپۆڕە بۆ ماڵەکەیان بە مانای ئەوە بوو کە ئەوەی لەو ماوەیەدا خەرجی کردووە بووە بە هیچ و بە فیڕۆ چووە. ئیڤان بە ڕق و ناقایلییەوە زەردەیەکی گرت و گوتی:

– نا! پێویست ناکا.

پراسکۆڤیا هێندێک مایەوە، پاشان چووە پێشێ و نێوچاوانی مێردەکەی ماچ کرد. ئەو کاتەی لێوی بە ناوچاوانییەوە نا و ماچی کرد ئیڤان لە ناخی دڵەوە لێیبێزار بوو و زۆر بە دژواری توانیی خۆی ڕاگرێ و بە پاڵپێوەنانێک لە خۆی دوور نەخستەوە.

– شەوخۆش ئیڤان، خودابکا خەوت لێبکەوێ!

– زۆر باشە!

## (٦)

ئیڤان ئیلیچ هەستی بە بوونی مەرگ دەکرد، بەڵام نەیدەتوانی و نەیدەویست تێیبگا. خەم و ترس سەرتاپای داگرتبوو، ئاراوقارای لێهەڵگیرابوو. ئەو بیرۆکە قیاسەی کە لە کایزوێتر[1] فێر بووبوو و سەبارەت بە بنەمای فەلسەفیی کانت بوو، وەبیری هاتەوە: «کایووس[2]یەک مرۆڤ بوو، مرۆڤەکان هەتا هەتایی نین، کەوایە کایووس تامی مەرگ دەچێژێ.» ئەم بابەتە کە سەبارەت بە کایووس بوو، شتێکی ڕاست بوو لە فەلسەفەدا، نەک لەبەر ئەوەیکە ڤانیا وردیلەی بنەماڵە بوو؛ هێشتاش چێژی خۆشەویستبوونی سەردەمی منداڵیی خۆی لە بیر بوو. ئەو ڤانیا[3]خنجیلە و گوڵەجەرگەی دایک و بابی بوو. خۆشیان دەویست و بە دڵ کەیفی پێدەکرد. دایکی هەبوو باوکی هەبوو، میتیا و ڤالۆدیای هەبوو. هەموویان یەک لەدوای یەک دەهاتنەوە بیری، دایکی و باوکی، لەیستۆکەکانی، عارەبانەچی، دایەنەکەی، بیرەوەریی شیرینی منداڵی لەگەڵ هەموو ئەوانە و بەتایبەت کاتیاچکوول، یاری و شادی، گریان و زیزبوون، گەشەونەشەی کاتی مێرمنداڵی و تافیلاوی، یانی کایووس ئاوای دەستی دایکی ماچ کردووە؟ هەورێشمینەکەی دایکی کایووس بۆ

1 Kiezewetter
2 Caius
3 Vanya سووکەڵە ناوی ئیڤان بۆ خۆشەویستی.



ئەویش ئاوا خشەخشی هاتووە؟ یانی کایووسیش لە قوتابخانە کاتێک خواردنەکانی بەدڵ نەدەبوو، ئاوا کێشە و هەڵڵای ساز کردووە؟ کایووس ئاوا ئاشق بووە؟ کایووس لە جێی ئەو بوایە دەیتوانی ئاوا کۆڕەکانی دادگا بەڕێوە بەرێ؟ کایووس بەڕاستی گیای مەرگ بوو و دەبوو بمرێ. «بەڵام بۆ من، ڤانیا چکوول، ئیڤان، لەگەڵ هەموو بیر و هەستەکانم، هەموو ئەوانە شتێکی جیاوازن. مەرگی من زۆر ترسناکە. زۆر دەترسم.»

«ئەگەر منیش وەکوو کایووس دەبێ بمرم، حەتمەن دەبوو بمزانیبایە. دەبوو ئیلهامێک لە ناخەوە ئەوەی بە من بگوتبایە، بەڵام وانییە، بارودۆخی من زۆر لەگەڵ کایووس جیاوازە. بەڵام هەرچۆنێکبێ مەرگ لێرەیە!»

ئیڤان فکر و خەیاڵ هەڵیگرت: «نابێ وابێ، شتیوا مەحاڵە! بەڵام لێرەیە. مەرگ چۆنە؟ مرۆڤ چۆنی تێدەگا؟»

ئیڤان توانایی ئەوەی نەبوو لە مەرگ تێبگات بەڵام نەک هەر فکری مەرگ بەڵکوو مەرگ خۆی لەگەڵیدا کەوتبووە ململانێ.

هۆکارێک کە سەردەمێک فکری مەرگی لێدەتاراند ئیتر بوونی نەبوو. ئێستا ئیڤان زۆربەی کاتی خۆی لە ڕابردوودا تێپەڕ دەکرد و بە کورتی لە خەیاڵی ڕابردوودا دەژیا. بەخۆی گوت: «دیسان دەستدەکەمەوە بە کارەکانم، من خووم بەوجۆرە ئەرکانە گرتووە.»

هەموو گومان و دوودڵییەکانی لە خۆی دەتاراند، دەچوو بۆ دادگا، لەگەڵ هاوکارەکانی دەکەوتە مشتومڕ و ئەو جۆرەی کە خووخدەی خۆیەتی بەبێ قەیدوبەند دادەنیشێ، بە چاوێکی بیرمەندانە و بە وردی

چاو بە ئامادەبووواندا دەگێڕێ و دوو دەستە لاوازەکەی دەنێتە سەر دەسکی کورسییە دارینەکە. وەک هەمیشە خۆی بەرەو لای هاوکارەکەی دەکێشێ و بەڵگە و پەروەندەیەک دەکێشێتە بەردەمی خۆی و بە سرتە شتێک بە یەکتر دەڵێن و بیرورا دەگۆڕنەوە. پاشان ڕاست دادەنیشێ، پەروەندەکە هەڵدەداتەوە و شتێک دەڵێ. بەڵام لە ناکاو ژانەکەی بێ‌ئەوەی گوێ بەو بارودۆخە بدات ئۆقرەی لێ‌هەڵدەگرێ. سەرەتا ئیڤان گرنگی بە ژانەکە نادات و دەیهەوێ خۆی لێ‌گێل بکات، بەڵام ناتوانێ و ئازارەکە ئەو دەبەزێنێ. لە جێی خۆی وشک دەبێ و دەکەوێتە دڵەکوتێ و هەناسەبڕکێ، لە خۆی دەپرسێ:
«یانی مەرگ ئاوا نزیکە لێم؟»

هاوکاران و فەرمانبەرەکانی بە سەرسوورمان و ناڕەحەتییەوە دەبینن کە قازی گێژ بووە و خەریکە تووشی هەڵە دەبێ. قازی خۆی هەڵدەگوشی و هەوڵدەدا ددان بە جەرگی خۆیدا بگرێ و وابنوێنێ کە خەریکی خۆ کۆکردنەوەیە. کۆتایی بە کۆڕەکە دێنێ و لەگەڵ ئەوەی خەفەت و دڵتەنگی ناخی دادەگرێ کە نەیتوانیوە نەخۆشییەکەی لە هاوکارەکانی بشارێتەوە بەرەو ماڵێ دەگەڕێتەوە.

ئیڤان بۆ ئەوەی خۆی لەو بارودۆخە دەرباز بکات بە دوای دڵنوایی و دەروویەکدا دەگەڕا، بەڵام هەموو هەڵاتن و دەربازبوونێک درۆیینەو کاتی بوون و برک و ژانەکە هەمووشتێکی لە خۆی دەپێچا و دەربازبوون لە چنگی مەحاڵ بوو.

ئیڤان دەچێ بۆ ژووری میوانداری کە بە دنیایەک هیوا و ئاواتەوە ڕازاندبوویەوە. هەر ئەو ژوورەی کە لەوێ لەسەر نێردیوان کەوتە



خوارێ و بە هۆی ئەوەوە (چەندە ناخۆش و لەگەڵ ئەوەشدا قۆڕ و بێ‌مانایە) ژیانی خۆی فیدا کرد. دەیزانی نەخۆشییەکەی بە هۆی ئەو زەبر وێکەتنەوەیە. لەپڕ دیتی سەرمێزەکە تۆزێ ڕووشاوە کە تێلی برینجی یەکێک لە ئالبۆمەکانی سەر مێزەکە ڕووشاندبووی. ئالبۆمێکی گرانبایی کە زۆر ڕێکوپێک و ئاشقانە وێنەکانی تێدا هەڵگرتبوو دەستی‌دایە و ئەلقە برنجییەکەی خستەوە جێی خۆی و نووشتاندییەوە، ئالبوومەکە لە چەند جێوە دڕابوو و هێندێک لە وێنەکان سەروبن کرابوون. ڕقی هەستا و ئەوانیشی ڕێکوپێک کردەوە.

پاشان بە زەینییدا هات کە مێز و ئالبۆمەکان بباتە سووچی ژوورەکە و لەلای گوڵدانەکان جێیان بکاتەوە. ویستی خزمەتکارەکەی بانگ بکات بەڵام ژنەکەی و کچەکەی هاتن بۆ یارمەتیی. ژنەکەی و کچەکەی ئەو جێگۆڕکەیەیان بە دڵ نەبوو. ژنەکەی دژایەتیی لەگەڵ کرد و دەمەقاڵێ و شەڕەدەندووکە دەستی‌پێکرد. بەڵام ئەم کێشە و دەمقڕەیە خەمباری نەکرد چونکە لەو کاتەدا ژان و فکری هیوابڕاوانە گیانی دانەگرتبوو.

بەڵام کاتێک ئالبۆمەکانی هەڵگرت، هاوسەرەکەی گوتی:

– تکایە ئیجازە بدە با خزمەتکارەکە ئەو کارە بکا. دیسان ئازار بە خۆت دەگەیێنی.

لە ناکاو لاکەلەکەی بە چریکە وێستا و ژان و برک لە کەلێنی پەردەکەوە هاتە ژوورێ. وادیارە ئەو ژانە دەستبەردار نابێ و بۆ لەنێو بردنی ئەو قۆڵی هەڵماڵیوە. مەرگ لەبەرچاوی زەق دەبۆوە و

ئیڤان‌ئیلیچ هێشتا تۆزێ هیوادار بوو کە ئاسەواری نەمێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا بیری لە لاکەلەکەی خۆی دەکردەوە. بەڵێ هەرکارێک دەکا لێی دوور ناکەوێتەوە و بەرۆکی بەرنادا، بە ئاشکرا لێی نزیک دەبێتەوە و لە پشت گوڵەکانەوە چاوەبرکێنەی لەگەڵ دەکا.

«ئەوانە هەموو بۆ چییە؟»

«یانی بەڕاستی وایە؟ من ژیانی خۆم بە هۆی هەڵواسینی ئەو پەردەیەوە لە دەستدا؟ ئەو کاتە هێندە دڵخۆش بووم ئاگام لە خۆم بڕابوو. یانی دەبێ وابێ؟ بەڕاستی ترسناکە و زۆریش گەوجانەیە!... دەچوو بۆ ژووری کارەکەی، ڕادەکشا و لەوێش دیسان لەگەڵ ئەو بەرەوڕوو دەبوو، لەگەڵ ئەو بە تەنیا دەمایەوە و هیچیشی لە دەست نەدەهات. تەنیا دەبوو چاو لە چاوی بکات و ترس سەرتاپای داگرێ، هەتا لەشی سارد دەبێتەوە.



## (٧)

هیچ کەس نەیدەزانی چۆن لە ماوەی سێ مانگدا ئەو نەخۆشینەی ئیڤان ئیلیچ ئاوا ڕیشاژۆی کرد. بەرەبەرە و لەسەرەخۆ لەناخەوە دەیپووکاندەوە. ئاخری وای لێهات ژنەکەی و کوڕ و کچ و خزمەتکاران و ناسیاو و دەروجیران و پزیشکەکان، لە هەموویان گرینگتر خۆشی دەیانزانی چاکبوونەوەی مەحاڵە و دەبێ بارگەوبنەی بپێچێتەوە. دەیزانی تەنیا هەستێک کە لە دڵی دەوروبەرییەکانیدا وەئاگا هاتووە ئەوەیە کە دەبێ بڕوات و بەرچاویان چۆڵ بکات. لەوە زیاتر زیندووەکان ئازار نەدات.

ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر تووشی بێخەوی دەبوو. مۆرفینیان پێدەدا تاکوو بە شێوەی کاتی تووشی خەواڵوویی و سستیی بکات و تۆزێ ژانەکەی هێدی بکات.

بە دەستووری پزیشک خواردنی تایبەتیان بۆ سازدەکرد، بەڵام هەموو ئەو خواردنانە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بێتامتر و ناخۆشتر دەبوون و ئیتر ئیشتییای بۆیان نەدەچوو.

بۆ ئەوەی باشتر بتوانێ میز و پیسی بکات، ڕێوشوێنێکی تایبەتیان بۆ دانابوو، هەرجارێکیش کە ئەو کارەی لە هەنتەشی کەسێکدا دەکرد

که پێویست بوو یارمەتیی بدات ئەوەندەی دیکە ئازارەکەی پەرەی دەساند و برستی لێدەبڕی. کاری پەرستارییەکەی بە یەکێک لە خزمەتکارەکانی سپێردرابوو کە ناوی گراسیم بوو، ئەو بۆ خاوێنکردنەوە و بردنە دەرێی میز و پیسییەکەی و کاروبارەکانی دیکەی ئیڤان سەردانی ژوورەکەی دەکرد.

گراسیم کوڕێکی گوندنشین بوو کە چۆنیەتیی خزمەتکردن بە ئەربابەکان لە خۆیان فێر بووبوو. سەرەتا کاتێ گراسیم هات بۆ خاوێنکردنەوەی پیسییەکەی چونکە دیتی زۆر لاوێکی ڕێکوپێک و جوانچاکە، تووشی شڵەژانێکی سەیر بوو و بەڕاستی بێزی لە خۆی هەستا و تەنانەت لە خۆشی بێزار بوو. جارێکیان کاتێک لەسەر لەگانەکە هەستا بە هۆی بێهێزییەوە نەیتوانی پانتۆڵەکەی هەڵکێشێتەوە، کەوت بەلادا و خۆی بە قەنەفەکە گرتەوە. کاتێک چاوی بە ڕانە لاواز و ڕەقەڵەکانی خۆی کەوت، ترسێک لە هەناوی گەڕا و ئازای ئەندامی کەوتە لەرزین. هەر لەو کاتەدا گراسیم بە هەنگاوی توند و قایم هاتە ژوورێ کە پۆستاڵە قورسەکانی بۆنی خۆشی خوناوەی باران و هەوای تازەی زستانی لێدەهات و بەروانکەیەکی کندێلەی خاوێنی لێدابوو. قۆڵی هەتا هەنیشکی هەڵکردبوو و بۆ ئەوەی ئەربابەکەی هەست بە شەمەزاری نەکا چاوی لێنەکرد. لەگەڵ ئەوەی وزە و لەشساغی بە ڕەوت و ڕۆینییەوە دیاربوو، ڕۆیشت بۆلای لەگانەکە.

ئیڤانئیلیچ بە دەنگێکی کز و بە بێتاقەتییەوە گوتی:

– گراسیم.



گراسیم لە ترسی ئەوەی نەکا هەڵەیەکی کردبێ خێرا سەری وەرسووڕاند چاوی لە ئەربابەکەی کرد و گوتی:

– بەڵێ قوربان؟

– ئەو کارە دەبێ بۆ تۆ زۆر ناخۆش و پڕئازار بێ، وانییە؟ دەبێ لێمببووری. من ناتوانم.

گراسیم بزەیەکی پڕ لە مێهرەبانی نیشتە سەرلێوی و وەڵامی دایەوە:

– خەمت نەبێ ئەرباب، ئێوە نەخۆشن.

لەگانەکەی هەڵگرت و لە ژوورەکە چووە دەرێ. دوای پێنج خولەک هەروا توندوتۆڵ و بە ئارامی هاتەوە ژوورێ. ئیڤان هەروا بە لینگی ڕووتی لەسەر مۆبلەکە دانیشتبوو. گراسیم لەگانە خاوێن و شۆراوەکەی لە جێی خۆی دانایەوە. ئیڤان گوتی:

– گراسیم، تکایە یارمەتیم بدە!

گراسیم چوو بۆلای.

– یارمەتیمدە، دەمەوێ بە پێوە ڕاوەستم.

گراسیم بە دەستە بەهێزەکانی زۆر شارەزایانە و بە دڵۆڤانییەوە بنپیلی ئەربابی گرت و بەرزی کردەوە، بە دەستێکی لەنگەری گرت نەکەوێ و بە دەستەکەی دیکەی پانتۆڵەکەی بۆ هەڵکێشایەوە. گراسیم بەبێ قەوە لەخۆدان و زەحمەتی زۆر، وەک ئەوەی ئەربابەکەی لە باوەش کردبێ، هەڵیگرت و هێواش لەسەر قەنەفەکە ڕایکێشا.

– سپاست دەکەم. چەندە باش و بە ئاسانی ئەو کارەت ئەنجامدا!

گراسیم بە بزەیەکی پڕ لە دڵۆڤانییەوە دیسان چاوی لە ئیڤان کرد. ئیڤان کە لەلای گراسیم هەستی بە هێمنایەتی دەکرد، دەیویست بە هەر بیانوویەک بێ زیاتری لە ژوورەکەی خۆی ڕاگرێ. تۆزێ ملی خوار کردەوە و گوتی:

گراسیمگیان تکایە ئەو کورسیلەیە بخە ژێر لاقم. کاتێک لاقم لەسەر شتێک دادەنێم ژانی کەلەکەم کەمترە.

گراسیم کورسیلەیەکی هێنا و هەردوو لاقی ئەربابی بەرز کردەوە و کورسیلەکەی هێنایە پێشێ و لاقی ئەربابی لەسەر دانا. ئیڤانئیلیچ هەستی کرد کاتێک کە گراسیم لاقی لە باوەش گرتبوو و بەرز ڕایگرتبوو تا کورسیلەکە بنێتە ژێر پێی هەستی بە ژانێک نەکرد. بۆ ئەوەی دڵنیابێ وایە، دیسان گوتی:

– باڵنجێکیش لەسەر کورسیلەکە دانێ.

ئەمجارەشیان کە گراسیم لاقی بەرز کردەوە هەستی بە تۆخژنێک کرد، بەڵام هەرکە لاقی لەسەر باڵنجەکە دانایەوە دیسان ژانەکە دەستیپێکردەوە.

ئیڤان پرسی: گراسیم تۆ ئێستا چ کارێکت هەیە؟

گراسیم کە فێر بووبوو چۆن لەگەڵ ئەربابەکەی قسە بکا، گوتی: هیچ قوربان، هیچ کارێکم نییە.

– ئەگەر ئێستا بڕۆی چ کارێکت هەیە ئەنجامی بدەی؟

– هەموو کارەکانم ئەنجام داوە، تەنیا شکاندنی ئێزنگم ماوە کە بۆ سبەینێ پێویستمان پێیدەبێ.

– دەتوانی هێندێ زیاتر لاقم بەرز ڕاگری؟



– ئەرێ چۆن ناتوانم قوربان.

گراسیم هەردوو لاقی لە باوەش گرت و بەرزی کردەوە، ئیڤان پێیوابوو بەوشێوە هیچ ژانێکی نییە و هەست بە ئازارە تاقەتبڕەکە ناکات.

– ئەی کەنگێ ئێزنگەکان دەشکێنی؟

– وەخت زۆرە خەمت نەبێ.

دوای ئەوە ئیڤان، بە بیانووی جۆراوجۆر گراسیمی لە ژوورەکەی خۆی ڕادەگرت و جگە لەوەی لاقی لەسەر شانی دادەنا، لە قسەکردنیش لەگەڵیدا چێژی وەردەگرت. پێوەندیی گراسیم لەگەڵی هێندە بە شێوەیەکی دڵۆڤانانە بوو کە ئیڤانی خستە فکرەوە. گراسیم تەنیا کەسێک بوو کە ئیڤان کاتێک دەیدی لەشساخ و بەدەماخە پێیخۆش بوو.

ئیڤانئیلیچ زۆری ئازار دەکێشا کە دەیدی بنەماڵەکەی ئاوڕی لێنادەنەوە. ئەوان دەیانویست پێیبسەلمێنن کە نەخۆشییەکەی مەترسیدار نییە و پێویستە خۆی ناڕەحەت نەکات و دەستوورەکانی پزیشک بەڕێوەبەرێ بەڵکوو ئاکامێکی باشی هەبێ. ئەوەش جگە لە فریودان هیچیتر نەبوو. هەمووان درۆیان دەکرد و ئەوەش ئاسانترین هەڵسووکەوت بوو لەگەڵ نەخۆشییەکەی ئەو.

ئەو زۆرجار دەیویست هاوار بکا: «ئیتر درۆکردن بەسە، من خۆم دەزانم مەرگ تەپی داوەتەسەرم.» بەڵام قەت هاوارێکی نەکرد. دەیتوانی تێبگا کە ڕووداوی ترسناکی مەرگی چۆن بەلای ئەوانەوە بێبایەخ و ئاساییە و تەنانەت وەک ڕووداوێکی دزێو و ناڕادەیەک

نەشیاو لێیان دەڕوانی. وەک کەسک کە پێ دەنێتە ژوورێکەوە و بۆنێکی ناخۆش لەگەڵ خۆیدا دێنێ. تەنیا گراسیم سەرنجی پێدەدا و دڵسۆزانە هاودەردیی لەگەڵ دەکرد. هەر بۆیەش تەنیا لەلای گراسیم هەستی بە دڵحەسانەوە و هێمنایەتی دەکرد. جاریوابوو گراسیم لە تەواوی ماوەی شەودا لاقی ئەوی لەسەر شانی دادەنا و بەرەوڕووی لە بەردەمی دادەنیشت و بە ئەربابەکەی دەگوت: «قوربان دڵی خۆت ناڕەحەت مەکە و خەمی منت نەبێ، من دواتر بەپێی پێویست دەخەوم و پشوو دەدەم، ئەگەر نەخۆش نەبوایەی فەرقی دەکرد، بەڵام ئێستا کە ئەوەندەم لەدەست دێ بۆ دریخی بکەم و ئەو تۆزە ماندووبوونە تامڵ نەکەم.» لەوماڵەدا تەنیا گراسیم بوو درۆی نەدەکرد و خەمی بۆ دەخوارد و پێوەی ماندوو بوو. ئەوان وردەوردە وەک هاورێیان لێهات و جارێکیان گراسیم بە ڕاشکاوی گوتی: «ئێمە هەموومان دەمرین، کەوایە بۆ دەبێ من یارمەتیی ئێوە نەدەم و وەک خەمرەوێنێک لە خزمەتتاندا نەبم؟»

گراسیم بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کە یارمەتیی کەسێک بدات کە لە سەرەمەرگدایە و هیوادار بوو کە لە کاتی مردنی خۆشیدا، کەسێک ئاوا ئاگاداریی لێ بکات و وەڵامی ئەو چاکەکارییەی بداتەوە.

ئیڤان دوای هەر برک و ژانێک وەکوو منداڵێک پێویستی بە چاوەدێری و پێڕاگەیشتن و دڵسۆزی و تەنانەت لاواندنەوەش هەبوو، بەهۆی سەرو ڕیشی ماشوبرینجییەوە لە تەمەنی خۆی ئاگادار بوو. بۆیە ئەوەی ئاواتی بۆ دەخواست مەحاڵ بوو، بەڵام ئەو ژان و برکەی



لاکەلەکەی وای بێهێز و کەلەلا کردبوو ئاتاجی دڵسۆزی و لاواندنەوە بوو. تەنیا کەسێکیش کە دەیتوانی ئەو کەمایەسییەی بۆ قەرەبوو بکاتەوە و دەردی لەسەر سووک بکات گراسیم بوو.

کاتێک هاوکارەکانی دەهاتن بۆ سەردانی، خۆی توندوتۆڵ و قیتوقۆز ڕادەگرت و هەوڵیدەدا وەکوو پێشوو بنوێنێ. بۆیە سەبارەت بە گرنگایەتیی کاروبارەکانی دیوانی باڵا ڕای خۆی دەردەبڕی و لەسەر بیروڕای خۆی پێداگریی دەکرد. ئەم تەشیڕێسی و خۆخەڵەتاندنەش شوێنێکی خراپی لەسەر دەورووبەرییەکانی دادەنا و تەنانەت لەو ڕۆژانەی کۆتاییی تەمەنیدا بەجارێ خۆی تاڵ کردبوو، بەجۆرێک کە خۆشی لە خۆی بێزار بوو.

## (٨)

بەیانی بوو، گراسیم ئەو بەیانییە بۆ ئیشێک چووبووە دەرێ و پیتێری پێشخزمەت خەریکی لادانی پەردەکان و کووژاندنەوەی مۆمەکان بوو. بەیانی، شەو، هەینی، شەممە یان یەکشەممە هیچ جیاوازییەکی نەبوو. ژان و برکەکەی ئیڤان‌ئیلیچ بۆ چرکەیەکیش هێدی نەدەبوو و ترووسکەی ژیان بەردەوام کز دەبوو و خەریک‌بوو شەوەزەنگی مەرگ هەڵیدەلووشی. نزیک بوونەوە لە مەرگ هەمیشە ترسناک و بێزارکەرە. بەڵام هەرچییەک بێ ڕاستییەکە و حاشای لێ‌ناکرێ.

پیتێر دەپرسێ: ئاغا چایی مەیل دەفەرمووی؟

– ئیڤان بیری کردەوە: «پیتێر دەیهەوێ کارەکان بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بچن و حەز دەکا ئەربابەکەی بەیانیانە چایی بخواتەوە.»

دوای تۆزێ بێدەنگی گوتی: نا.

– قوربان حەزناکەی لەسەر قەنەفە دانیشی؟

ئیڤان لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «ئەو دەیەوێ ژوورەکە خاوێن بکاتەوە و وادیارە من ڕێگام لێ‌گرتووە. من پیس و چەپەڵ و شپرێوم.»



– نا، بە تەنیا جێم‌بێڵە. بڕۆ دەرێ.

پیتێر بۆ ڕێکوپێک‌کردن و خاوێن‌کردنەوەی ژوورەکە دەهات و دەچوو. ئیڤان دەستی درێژ کرد. پیتێر ئامادە و چالاک گەیشتە بەردەمی:

– قوربان شتێکت پێویستە؟

– کاتژمێرەکەم.

پیتێر کاتژمێرەکەی دایەدەستی.

ئیڤان چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد، هەشت‌و نیوی بەیانی بوو. لە پیتێری پرسی:

– خانم و منداڵەکان لە خەو هەستاون؟

– نا قوربان. تەنیا ولادیمێر ئیڤانۆڤیچ (مەبەستی کوڕەکەی بوو) هەستاوە ئەویش چووە بۆ قوتابخانە. بەڵام خانم دەستووری پێداوم ئەگەر کارێکت پێی‌هەبوو خەبەری کەمەوە، بچم لە خەوی هەستێنم؟

– نا، پێویست ناکا.

دیسان خەیاڵ هەڵیگرت: «ڕەنگە خواردنەوەی چاییەک بەم بەیانییە خراپ نەبێ.»

بە دەنگی بەرز گوتی:

– چاییم بۆ بێنە پیتێر.

پیتێر ڕۆیشت بۆلای دەرگاکە، بەڵام ئیڤان لە ترسی تەنیا مانەوە گوتی:

– پیتێر دەواکانم بدەیە. ڕەنگە هێشتا کەڵکێیان هەبێ.

– کەوچکێکی پڕی شەربەت خواردەوە. بەڵام هەرکە تامی تفت و ئاشنا و قیزەونی شەربەتەکەی چێشت لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «نا، هیچ کەڵکێکی نییە. خواردنی ئەو دەوایانە تەنیا خۆ هەڵخەڵەتاندنە و بەس، بەڕاستی کارێکی گەوجانەیە. ئیتر ناتوانم بیانخۆم، بڕوام بەم سندان و ژەهرەمارانە نەماوە. بەڵام ئەم ژانە، نازانم ئەم ژانە دوابڕاوە بۆچی ساتێک دەستم لەکۆڵ ناکاتەوە و بڵێسەی ئازارەکەی دانامرکێ؟» پڕ بە سیەکانی هەناسەیەکی هەڵکێشا. پیتێر بە بیستنی دەنگی هەناسەکەی هەڵات بۆلای.

– هیچ نییە، بڕۆ چاییم بۆ بێنە.

پیتێر چووە دەرێ. ئیڤان کە تەنیا مایەوە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. ژان و بڕک بڕستی لێبڕیبوو، کەمتەرخەمی و ساردوسڕیی بنەماڵە و ئاشنا و دۆستانیش ئەوەندەیتر نەخۆشییەکەی لێقورس کردبوو. ئەگەر زووتر بهاتبایە! چی زووتر بهاتبایە؟ مەرگ، تاریکی؟... نا، نا! هەمووشتێک لە مەرگ باشترە.

کاتێک پیتێر بە کەشەفی چاییەوە هاتەوە، ئیڤان چاوی تێبڕی و ئەو ڕوانینە سەیر و شێواوەش بووە هۆی ئەوەی پیتێر دەست و لاقی تێکەڵ بێ و ئەو دەستەپاچە بوونەشی ئیڤانی وەخۆ هێنایەوە.

– چایی! زۆر چاکە. لەسەر مێزەکە داینێ، یارمەتیم بدە با دەست و دەموچاوم بشۆم و کراسێکی خاوێن لەبەر بکەم.

ئیڤان هەتا گەیشتە لای بەلۆعەکە و دەموچاوی شۆرد دووسێ جار ڕاوەستاو هەناسەی تازە کردەوە. فڵچەی لە ددانیدا و سەری شانە کرد و لە ئاوێنەکەدا لە خۆی ڕوانی. کە وێنەی خۆی لە نێو



ئاوێنەکەدا دی ترسی لێنیشت، بەتایبەت کە قژە ماشوبرینجییەکەی خۆی دی بە ناوچاوانییەوە نووسابوو. کاتی گۆڕینی کراسەکەی نەیوێرا چاو لە ئەندامی خۆی بکات. جلەکانی گۆڕی و لەگەڵ ئەوەی بەتانییەکی نەرم و تەنکیدا بەسەر شانیدا، بۆ خواردنەوەی چایی لەسەر قەنەفەکە دانیشت.

بۆ ساتێک هەستی بە شادی و بە دەماخی کرد. بەڵام هەر لەگەڵ چاییەکەی خواردەوە دیسان ژانەکەی هەناوی لەگەڵ تامە ناخۆش و بۆگەنەکەی دەمی هەست پێکرد. هەمیشە هەروا بوو. هێندێجار تروسکەی هیوایەک بەرچاوی ڕوون دەکردەوە، پاشان دەریای ئازار و ناهومێدی ڕۆح و جەستەی لە گێژا و فەرتەنەدا ئەوق دەکرد. کاتێک لە تەنیاییدا ترسەکە بە سەریدا زاڵ دەبوو، دەیویست بانگ لە کەسێک بکات. بەڵام دەیزانی ئەگەر کەسانێک لە دەوروبەری بن ئازارەکەی زیاتر دەبێ.

«بە دوکتۆر دەڵێم لە بیری ڕێگەچارەیەکی دیکەدا بێ. درێژە پێدانی ئەم بارودۆخە مەحاڵە.»

یەکدوو سەعات بەو شێوەیە تێپەڕی. گوێی لە زڕەی زەنگی دەرگای حەوشە بوو.

«ڕەنگە دوکتۆر بێ.» خۆیەتی. دوکتۆر بە ڕێکوپێکی و بە نەشەوە خۆیکرد بە ژووورێدا. بە ڕوانینێک کە دەتگوت دەڵێ: «دەی وادیارە تۆ لە شتێک بێزاری و لێیدەترسی، ئێستا هەموو شتێک جێبەجێ دەکەم.

بەڵام ئەو باش دەزانێ کە هیچ کارێکی لە دەست نایە و لە خۆڕا شاتوشووت دەکا. کردەوەی ئەو وەک کەسێک وایە کە بەیانی جلوبەرگی فەرمی لەبەر بکات و دەڕوا بۆ سەر کارەکەی. دوکتۆر بە توانا و متمانەوە دەستەکانی لە یەکتر هەڵساوی و گوتی:

– چەندە ساردە! دەڵێی زستان و سەهۆڵبەندانە. ئەو وشکە سەرمایە هەموو گیانی تەزاندووم. بە یارمەتیت تۆزێ خۆم گەرم دەکەمەوە.

دەتگوت ئەوەی گرنگە تەنیا گەرمبوونەوەی ئەوە و پاشان هەموو شتێک جێبەجێ دەکات.

– دەی چۆنی؟

هەستیکرد، دوکتۆر دەیەوێ بڵێ: «دەی، نەخۆشییەکەت چۆن ڕیشە دادەکوتێ و دەبێتە دەردێکی بێدەرمان؟» بەڵام بۆی دەردەکەوێ نابێ هیچ بڵێ. بۆیە گوتی:

– دەی شەوی ڕابردووت چۆن ڕابوارد؟

ڕوانینی ئیڤان دەیگوت: «تۆ بەڕاستی شەرم ناکەی؟» بەڵام دوکتۆر حەزی لە مانای ئەو ڕوانینە نەبوو. بۆیە وەڵامی دایەوە:

– وەک هەمیشە زۆر خراپ، ئەو ئازارە دەستم لەکۆڵ ناکاتەوە و بۆ ساتێک هێدی نابێ، ئەگەر تەنیا شتێک...

– بەڵێ نەخۆشەکان هەمیشە هەروان... دەی باشە، ئێستا پێموایە بە تەواوی گەرمم بۆوە. تەنانەت پراسکۆڤیاش کە زۆر وردبینە ناتوانێ ئیرادی لێبدۆزێتەوە. دەی، ئێستا دەتوانم بڵێم بەیانیت باش. ـ دەستی بردە پێشێ و دەستە گەرم و ڕەقەڵەکەی ئیڤانی گوشی. گاڵتەی



وەلانا و بە ڕوخسارێکی جیددییەوە پشکنینی دەستپێکرد: نەبزی دەگرێ، پاشان گوێ لە پلەی گەرمای لەشی و دوای ئەویش ترپەی دڵی و نیخەی سەرسنیگ و سییەکانی دەگرێ.

ئیڤان بە باشی دەیزانی کە هەموو ئەو پشکنینانە بێهوودەن، بەڵام کاتێک دوکتۆر چۆکیدادا و بەسەر ئەودا نووشتایەوە، سەرەتا گووشییەکەی هەڵێنا و پاشان هێنایە خوارێ و بە شێوەیەکی مانادار لەسەر جەستەی هێندێ جووڵەی ژیمناستکشێوەی ئەنجامدا، ئەو تەسلیم بوو، هەروەک چۆن تەسلیمی وتە و بەڵگەهێنانەوەی پارێزەرەکان دەبوو.

دوکتۆر هێشتا هەر لەسەر چۆک بوو و خەریکی پشکنین بوو کە خشەخشی داوێنی کراسە هاورێشمینەکەی پراسکۆڤیا لەلای دەرگاکەوە هات. ئەو بۆڵەی دەهات و دیاربوو پیتێری سەرکونە دەکرد کە بۆچی زووتر ئەوی لە هاتنی دوکتۆر ئاگادار نەکردووە.

هاتە ژوورێ. مێردەکەی ماچ کرد و هەولیدا بیسەلمێنێ کە زۆر لەمێژە لە خەو هەستاوە و تەنیا بە هۆی خەمساردیی خزمەتکارەکان نەیتوانیوە لە کاتی خۆیدا لە ژووری مێردەکەی ئامادە بێ.

ئیڤان، چاوێکی لە سەرتاپای پراسکۆڤیا کرد. بە دیتنی دەست و مەچەکی گۆشتن و گەردن و سەرسنگی سپی و سۆڵ و هەروەها بریقەی قژ و ترووسکەی ڕوونی چاوەکانی ڕقی هەستا. لە ناخی دڵەوە لێیبێزار بوو و کاتێک لێوی پراسکۆڤیا لە ڕوومەتی درا بێزی لێی هەستا.

ئاکاری پراسکۆڤیا سەبارەت بە نەخۆشییەکەی گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو. هەروەک چۆن دوکتۆر پێوەندییەکی دیاریکراو لەگەڵ نەخۆشەکەی دادەمەزرێنێ و ناتوانێ بیگۆڕێ، پراسکۆڤیاش ئاکارێکی ئاوا چەقبەستووی هەبوو. ئەو ئیڤانی بە خەتابار دەزانی، چونکە دەستوورەکانی بە جوانی بەڕێوە نەدەبرد.

– دوکتۆر، گوێ بە قسەی من نادا و دەواکانی لە کاتی خۆیدا ناخوا. هەروەها لاقی بەرز دەکاتەوە و دەخەوێ کە بێگومان خراپە بۆی.

هەروەها بۆ دوکتۆری باسکرد کە چۆن گراسیم ناچار دەکا لاقی هەڵێنێ. دوکتۆر بە پۆز و دەمارێکەوە بزەی هاتێ و بە لەبزێکی دڵۆڤانەوە گوتی:

– چارە چییە، نەخۆشەکان لەوجۆرە خەیاڵ و باوەڕە گەوجانەیان هەیە، ئێمە دەبێ لێیان بە دڵەوە نەگرین و لێیان ببوورین.

دوای ڕۆیشتنی دوکتۆر، پراسکۆڤیا بە ئیڤانی گوت کە زۆر لەو پشکنینە ڕازییە، بەڵام ئەمڕۆ دوکتۆرێکیتر دێ بۆ دیتنی و کە دەبێ نەتیجەی پشکنینەکانی ئەو لەگەڵ پزیشکی بنەماڵەکەیان میخائیل دانیلۆڤیچ[1] بێننەگۆڕێ. پاشان بە توانجەوە گوتی:

– تکایە دژایەتی مەکە. من ئەو کارەم لەبەر خاتری خۆم کردووە.

ئیڤان تێگەیشت کە کارەکانی پراسکۆڤیا تەنیا بۆ خۆڕانانە و زیاتر لەبەر ئەوەیە بە دەوروبەرییەکان بسەلمێنێ کە هاوسەرێکی باش و

1 Michael Danilovich



دڵسۆزە. هەروەها وابنوێنێ کە ئەوەی بەلایەوە گرینگە و لێیخافڵ نییە تەندرووستیی مێردەکەیەتی. چونکە ئیڤان زۆر بە باشی جیاوازیی نێوان ڕاستی و دڵسۆزی و خۆڕانانی هەست پێدەکرد و لە ئاکاری ژنەکەیدا ڕێژەیەک پەرۆشی و دڵسۆزیی نەدەدی.

ئیڤان چوو دەمالێ فیکرەوە. دەیزانی کەوتۆتە داوی مەکر و دەهۆیەکی ژنانەوە و تێیدا گیرۆدە بووە. ڕوونکردنەوەی ئەو هەستەش لەوکاتەدا کارێکی زۆر دژوار بوو.

سەعات یازدە و نیو پزیشکی تازە هات بۆ دیتنی. دیسان پشکنین و پرسیار و وەڵام دەستیپێکرد. ڕیخۆڵەکوێرە، گورچیلە و خراپ کارکردنیان بابەتی سەرەکی بوو. لە ئاکامیشدا ڕەوشتی دەرمان و چۆنیەتیی دەواخۆرییەکەی تاڕادەیەک بۆ گۆڕی. پزیشکی تازە بە ڕوانینێکەوە کە هیوابڕاوانە نەبوو ماڵئاواییی لێکرد. ئیڤان بە ناهومێدییەوە پرسیی:

– دوکتۆر هیچ هیوایەک هەیە بۆ چاکبوونەوە؟

دوکتۆر لە وەڵامدا گوتی: تەواو دڵنیا نیم، بەڵام بۆ ئەوە دەبێ هیوادار بین. تۆش خەمت نەبێ و ورە بەرمەدە.

ڕوانینی هیوادارانە ئیڤانئیلیچ بۆ بەڕێکردنی دوکتۆر هێندە خەماوی و دڵتەزێن بوو کە تەنانەت پراسکۆڤیا فێدرۆڤناش کاتێک لەگەڵ دوکتۆر چووە دەرێ تاکوو پارەی ویزیتەکەی پێبدا دەستیکرد بە گریان.

هیوایەک کە وتەکانی دوکتۆر خستبوویە دڵی ئیڤانەوە زۆری نەخایاند و دوای ڕۆیشتنی دوکتۆر هەموو شتێک هاتەوە سەر

دۆخەکەی پێشوو. دیسان هەر ئەو ژووره و وێنەکان و پەرده پەنجەرەکان و شووشەی دەوا و دەرمان و لەشە بێهێز و نەخۆشەکەی و ژان و برکی بێبڕانەوه. ئیڤانئیلیچ دەستیکردەوه بە ناڵەناڵ و بە ناچاری دەرزیی مۆرفینیان لێدا و دوای تاوێک خەوی لێکەوت.

لای ئێواره هەوا تاریکوڕوون بوو کە وەهۆش هاتەوه. شێویان بۆ هێنا. زۆر بە زەحمەت توانیی تۆزێ گۆشتی سوور و چاییەک قووت بدا. دەیزانی شەو بە سەردا دێ. دوای خواردنی شێو سەعات حەوت پراسکۆڤیا بە جلوبەرگی شەوەوه هات بۆ ژوورەکەی. مەمکی توند و خڕوخۆڵی لە نێو ستیانەکەیدا قوت بووبۆوه و کوڵمە و لێوی سوور کردبوو. بەیانی بە گوێی مێردەکەی هەڵێنابوو کە شەوێ دەچن بۆ بینینی شانۆ. سارا بێرنار[1] شانۆیەکی بەڕێوه دەبرد و پراسکۆڤیا زۆری هەوڵ دابوو تاکوو توانیبووی لۆژێک بۆ بنەماڵەکەیان بگرێتەوه. ئیڤانئیلیچ ئەگەرچی بۆ بینینی شانۆ دژایەتیی نەدەکرد و زۆریشی پێخۆش بوو، بەڵام ئێستا ئاڕایش و خۆلەگوڵدانی ژنەکەی لە ناخەوه ئازاری دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا لە دڵی خۆیدا بیری کردەوه: «شانۆ بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکان باش و بەکەڵکە و زەوقی هونەرییان گەشە پێدەدا.» چونکە خۆی بۆ وەدەستهێنانی لۆژ و چوونی بنەماڵەکەی بۆ شانۆ پێداگریی کردبوو، ددانی بە خۆیدا گرت و دڵگرانییەکەی شادەوه و هیچی نەگوت.

1 Sarah Bernahart – ٤٤ ئەکتەری فەرەنسی.



پراسکۆڤیا کە خۆپەرستانە و شاییبەخۆ، بەڵام بە حاڵەتێکی هەستکردن بە تاوان پێی نایە ژووری مێردەکەیەوه، لە پاڵیدا دانیشت و چاکوچۆنیی لەگەڵ کرد. لێپرسینەکەشی تەنیا لەبەر بەجێهێنانی ئەرک بوو. پراسکۆڤیا هەوڵی دەدا بۆی ڕوون بکاتەوه کە ئەو مانەوه لە ماڵێ و دانیشتن لەلای ئەوی پێخۆشتره و هیچ گرنگایەتییەک بە چوونی شانۆ نادا. بەڵام چونکە دەزگیرانی کچەکەشیان دەچێ بۆ ئەو شانۆیە جوان نییە ئەوان بە تەنیا بنێرێ و لەگەڵیان نەچێ. هەروەها داوای لێکرد لە کاتی خۆیدا دەواکانی بخوا. پاشان ژنەکەی گتێکی گرت و گوتی:

– ئیڤان، لیزا و دەزگیرانەکەی دەیانهەوێ بێن بۆلات و چاویان پێت بکەوێ، ئیجازه دەدەی بێن؟

– زۆر چاکە با بێن.

کچەکەیان دڵخۆش و لێو بەبزه و بە ئاشکرا دیاربوو ئاشقە، بە کراسی تەنک و شان و ملی ڕووت و سپی و ناسکەوه هاتە ژوورێ و دیاربوو کە بە هیچ شێوەیەک دڵی بڕوایی نادا نەخۆشی و مەرگی باوکی ببینێ کە لەلایەکەوه باوکی لەدەست دەدات و لە لایەکیتریشەوه دەبێتە کۆسپێک لەسەر ڕێگای بەختەوەریی ئەو. دوای ئەو فێدۆر پترۆڤیچ دەزگیرانی کچەکەی هاتە ژوورێ کە ئەویش مووی سەری لوول کردبوو و بە جلوبەرگی شەوەوه زۆر قۆز و لەباری دەنواند. بە دوای ئەویشدا ڤاسیا[1]ی کوڕی هاتە ژوورێ

1 Fasya

کە ئەویش قیتوقۆز یۆنیفۆرمی نوێی لەبەر کردبوو. بەرچاوی بە شێوەیەکی ترسناک شین هەڵگەڕابوو کە ئیڤان هۆیەکەی دەزانی. ڤاسیاش وەکوو گراسیم خەمی ئەوی بوو، ئەو خەم و پەرۆشییەش لە ڕوانینە مات و ترسلێنیشتووەکانیدا دیاربوو. هەموو دانیشتن. چەند ساتێک هەموویان بێدەنگمان و متەقیان نەکرد.

لیزا داوای دووربینەکانی ئۆپیرای لە دایکی کرد و لەسەر ئەوەی دیارنەبوون دەمەقاڵێ لە نێوانیاندا سەریهەڵدا و لە یەکتری زیز بوون.

فیدرۆپترۆڤیچ لە ئیڤانئیلیچی پرسی کە سارا بێرناردی دیتووە یان نا؟ ئیڤان سەرەتا تێگەیشت، بەڵام دواتر وەڵامی دایەوە:

– نا! بۆ ئێوە پێشتر دیتووتانە؟

– بەڵێ لە ئادرین لیکووڤروور[1].

پراسکۆڤیا ئاماژەی بەو ڕۆڵانە کرد کە سارا بێرنار بەوپەڕی شارەزاییەوە دەیگێڕێ. بەڵام کچەکەی لەگەڵ ئەو هاوڕا نەبوو و دیسان شەڕەدەندووکەی دایک و کچ دەستیپێکردەوە. ئەمجۆرە کێشە و دەمقڕانە هەمیشە بە بێئاکام کۆتاییان پێدێ.

بۆ چەند ساتێک هەموو بێدەنگ بوون. ئیڤانی نەخۆش و کەلەلاش زویر و خەمبار چاوی لە خاڵێکی نادیار بڕیبوو. لیزا یەکەم کەس بوو کە پرکێشیی کرد و بێدەنگییەکەی شکاند. چاوێکی لەو کاتژمێرە کرد

1 Adrienne Lecouvreur



کە باوکی بە دیاری بۆی کڕیبوو و پاشان چاوێکی مانادارى لە دەزگیرانەکەی کرد کە پێوەندییەکی تایبەتی نێوان خۆیان بوو، گوتی:

– دەی ئەگەر پێویستە بڕۆین ئێستا کاتی ڕۆیشتنە.

ئەوەی گوت و لەگەڵ ئەوەی کراسەکەی خشەخشی لێدەهات هەستا سەرپێ.

هەموو هەستان، شەوخۆشییان بە ئیڤان گوت و ڕۆیشتن.

کاتێک هەمووان ڕۆیشتن، ئیڤان هەستیکرد حاڵی باشتر بووە و لە چنگ ئەو کێشە و دووڕووییانە ڕزگاری بووە. سەعات و خولەک یەک بە دوای یەکدا تێپەڕین. ژان هەروا چنگی لە هەناوی گیر کردبوو و وێنەدەچوو هێدی بێت و نیشتنەوەی ئەو فەرتەنە و شەپۆلە گڕئاسایەی ناخی دانەدەمرکایەوە. بۆیە دیسان ترس باڵی بەسەر ڕۆحیدا کێشایەوە.

دوای ڕۆیشتنی ئەوان پیتێر هاتە ژووری و لێیپرسی کە هیچی پێویست نییە؟ ئیڤان لە وەڵامی پرسیارەکەیدا گوتی:

– بە گراسیم بڵێ بی بۆلام.

## (۹)

ئەوان شەودرەنگان هاتنەوە بۆ ماڵێ. پراسکۆڤیا بە پێدزکە و بە ئارامی چووە ژوورەکەی ئیڤان و کە ترپەی بەئاستەمی پێی هات ئیڤان چاوی هەڵێنا و کە ژنەکەی دی خێرا چاوی قووچاندەوە. پراسکۆڤیا حەزی دەکرد گراسیم دەرکات و خۆی لەلای بمێنێتەوە. بەڵام ئیڤان چاوی هەڵێنا و گوتی:

– تۆ لێرە چ دەکەی؟ برۆ دەرێ.

– ژانت زۆرە؟

– وەک هەمیشە.

– هێندێک مۆرفینت بۆ بێنم؟

ئیڤان بە ناچاری پێمل بوو و برێکی خوارد. هەتا سەعات سێی نیوەشەو مۆرفینەکە گێژی کرد و دەتگوت بە گوشارێکی زۆر دیخەنە نێو کیسەیەکی ڕەش وقووڵەوە و هەرچی هەوڵ دەدەن ناتوانن بیخەنە نێوی؛ ئەو کارە زۆر ترسناک بوو و ئازارێکی زۆری هەبوو، خۆشی ئەگەرچی زۆر دەترسا بەڵام دەیویست خۆی بخاتە نێو کیسەکەوە و لاقەفرتێی دەکرد. بەڵام لە ناکاو لە دەستیان بەربۆوە و کەوتە نێو کیسە قووڵ و تاریکەکەوە. لە ترسی ئەو کەوتنە واداچڵەکی خەبەری بۆوە. کە چاوی هەڵێنا گراسیم لەبەر پێیدا دانیشتبوو و لاقە کزەکانی ئەوی بە گۆرەوییەوە لە سەر شانی دانابوو، ئارام و سەبوورانە وەنەوزی دەدا.

ئیڤان لە ژێر لێوەوە گوتی:

– گراسیم برۆ.



– نا قوربان خەمی منت نەبێ، جارێ هەر لێرە دەبم.

– نا، نا، برۆ.

لاقی لەسەر شانی گراسیم لابرد، لەسەر لاتەنیشت خەوت و خەمی بۆ حاڵی خۆی خوارد و زۆری دڵ بە خۆی سووتا. چاوەڕێ بوو گراسیم لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ و پاشان وەک منداڵ بۆ ئەو تەنیایی و بێدەرەتانییەی خۆی و بێبەزەییبوونی مرۆڤەکان و عەداڵەتی یەدزان گریا.

– خودایە بۆ منت خولقاند؟ بۆ؟ بۆچی ئاوا ئازارم دەدەی؟ ئەم ئازارە ترسناکە چییە ڕۆح و جەستەی داگرتووم؟

چاوەڕێی وەڵام نەبوو، دیسان دەستیکرد بە گریان. هیچ وەڵامێک نەبوو و نەدەبوو بشبێ. ژان و برکەکە دیسان سەریهەڵدایەوە، بەڵام ئەمجارەیان نە جینگڵی لە خۆیدا و نە بانگی کەسی کرد. هەروا لەسەر لاتەنیشت سەری کردە سەرقۆڵی خۆی و لەبەر خۆیەوە گوتی: «دەی وەرە دەی، دەی چنگ لە ئێسک و دەمارم گیرکە، وەک دۆڵپا سواری کۆڵمبە و بە چۆکمدا بێنە، بەڵام بۆچی، بۆ ئاوام لێدەکەی؟ مەگین من چیم لە تۆ کردووە، بۆچی ئاوا ئازارم دەدەی؟

پاشان بە ئارامی هەناسەی لە سینگیدا کۆ کردەوە. پێیوابوو دەنگێک دەبیستێ. بەڵام دەنگەکە لە ناخی زەینی خۆیەوە بوو. «تۆ چیتدەوێ؟ تۆ چیتدەوێ؟»

لەبەرخۆیەوە دووپاتی کردەوە و وەڵامی خۆشی دەدایەوە: «من چیمدەوێ؟ دەمهەوێ زیندوو بم و ئازار نەکێشم.»

دیسان دەنگەکە دەیپرسی: «دەتەوێ بژیی؟ ئاخەر چۆن؟»

«وەک ڕابردوو.»

سەرتاپای بوو بە گوێ و وەها هەناسەی لە سینگی خۆیدا کۆ کردەوە تەنانەت ژانەکەی لە بیر چۆوە، دەنگەکەی ناخی دووپاتی دەکردەوە: «هەر بەوجۆرەی لە ڕابردوودا ڕاتدەبوارد؟ شاد و دڵخۆش بە کەیفی خۆت؟»

ئیڤانئیلیچ دەستیکرد بە بیر کردنەوە و هێنانەوە بەرچاوی خۆشترین سات و کاتەکانی ژیانی. بەڵام تەنیا لە بیرەوەرییەکانی کاتی منداڵیدا شادی و خۆشی هەبوو؛ منداڵییش خۆ تازە ناگەڕێتەوە. هەتا لە سەردەمی منداڵی دوور دەکەوتەوە و لە ئێستا نزیک دەبۆوە شادییەکانیش کاڵتر دەبوونەوە. لە کۆلیژی مافیش تۆزێ شادی و دڵخۆشی هەبوو. یەکەم ساڵی دامەزرانی، ئەو کاتەی لە شارەوانی خزمەتی دەکرد، هێشتا کەمتاکورتێ خۆشی هەبوو، بۆ وێنە کاتی ئاشقبوونی. تا دەهات ساتە خۆشەکان کەمتر دەبوونەوە. زەماوەند کردنەکەی تەنیا ڕووداوێک بوو کە سات و کاتی خۆشی تێدا هەست پێنەدەکرا. بۆنی ناخۆشی هەناسەی ژنەکەی، لووتبەرزی و دووڕوویی، کاروباری فەرمانگە و گیروگرفتە ماڵییەکان، ساڵێک، دوو ساڵ، دە ساڵ، بیست ساڵ.

«دەڵێی لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بەرەبەرە پووکاومەتەوە و بەرەو نزمایی داکشاوم. وەک کەسێک کە لەسەر کێوێکەوە دادەگەڕێ، ئەگەرچی خۆی پێیوایە بەرەو بەرزایی هەڵدەزنێ. من پێموابوو بەرەو بەرزایی هەڵدەکشێم، بەڵام سات بە سات و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ژیانم زیاتر بەرەو زەواڵ دادەکشا. ئێستاش هەمووشتێک تەواو بووە و تەنیا مەرگ ماوەتەوە و ڕێگای پێگرتووم.»

«ئاخەر ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ نابێ نا، مەحاڵە ژیان تا ئەو ڕادەیە بێمانا بێ، ئەویش ئاوا ترسناک و بێهوودە. ئەگەر بەڕاستی هەموو ژیان تا ئەو



ڕادەیە هیچ و بێمانایە، کەوایە بۆ دەبێ پیاو بمرێ، ئەویش چ مەرگێک؟ حەتمەن دەبێ شتێک جگە لەوە بێ.»

لە ناکاو ئاوا بە بیریدا هات: «ڕەنگە ئەوجۆرەی کە شیاوە و پێویست بووە نەژیاوم. بەڵام چۆن دەبێ وابێ؟ یانیچی؟» ـ کتوپڕ وەخۆ دەهاتەوە و بەخۆی دەگوت: «بەڵام کاتێک من ئەوەی پێویست بووە ئەنجامم داوە چۆن شتیوا دەگونجێ؟» هەر خێراش ئەم تەنیا ڕێگە چارەیەی مەتەڵەکانی مەرگ و ژیانی وەکوو کارێکی زۆر دژوار و مەحاڵ لە خۆی دوور دەخستەوە.

«ئێستا چیتدەوێ، دەتەوێ بژیی؟ چۆن بژیی؟ وەک ئەوکاتەی لە دادگا بووی و نووسیاری دادگا ڕایدەگەیاند: قازی تەشریفی هێنا! قازی تەشریفی هێنا! هەموو هەڵدەستنە سەرپێ!»

لەبەرخۆیەوە دووپاتی کردەوە: «قازی لێرەیە، خۆ قازییەک لەگۆڕێدا نییە.» بە تووڕەیی هاواری دەکرد: «بەڵام من تاوانبار نیم.»

کوڵی گریانەکەی دەنیشتەوە، دەکەوێتە سەرشانەکەیتری و ڕوو دەکاتە دیوارەکە و تەنیا بیر لە شتێک دەکاتەوە. «ئەم هەموو ترسە بۆچی؟ ئەم هەموو خەم و گریان و ترسانە لەبەرچی؟»

بەڵام هەرچەندی بیری دەکردەوە و سەری دێنا و دەبرد هیچ وەڵامێکی نەدەدۆزییەوە. کاتێک کە وەک هەمیشە ئەو فیکرە بە مێشکیدا دەهات کە هەموو ئەوانە لەبەر ئەوەیە کە ئەو جۆرەی پێویستە نەژیاوە، لەڕێوە چاکە و ڕاستییەکانی ژیانی خۆی وەبیر دەهاتەوە و ئەم بیرە سەیر و ترسناکەی لە خۆی دەتاراند.

## (١٠)

دوو حەوتووی دیکە تێپەڕی. ئیڤان‌ئیلیچ ئیتر نەیدەتوانی لەسەر قەنەفەکە هەستێ. ئەو نەیدەویست لەسەر تەختەکەی بخەوێت و زیاتر لەسەر قەنەفەکە خۆی ڕادەکێشا و ڕووی لە دیوارەکە دەکرد و بە تەنیا لەگەڵ ئازار و دەردە بێ‌دەرمانەکەی خۆی هەڵیدەکرد و خەیاڵی بێ‌بڕانەوە هەڵیدەگرت و لەگەڵ بیرەوەرییەکانی ڕابردووی دەژیا. بیرەوەرییەکانی یەک لەدوای یەک لە هەمبەریدا قوت دەبوونەوە. دەبوونە وێنەیەک و بە نزیکترین بیرەوەری دەستیان‌پێدەکرد و دەگەڕانەوە بۆ ڕابردوویەکی دوور و سەردەمی منداڵی و لەوێدا دەگیرسانەوە. تامی هێندێک لە خواردنەکان ئەوی بەرەو قووڵاییی بیرەوەرییەکانی منداڵی دەبردەوە و کاتێک دیسان وەخۆ دەهاتەوە لە دڵی خۆیدا دووپاتی دەکردەوە: «نا، من نابێ بیر لەو شتانە بکەم... بەڕاستی زۆر تاڵ و بەژانە.» ئیڤان لە کاتی تەنیاییدا بەردەوام بیری لە مەرگ دەکردەوە، سێ مانگ بەر لە ئێستا چۆن بووە و ئێستا چۆنە و چیی لێ‌هاتووە. «یانی ئەمە چییە؟ یانی بەڕاستی کاتی مەرگم هاتووە ئەی ئەم هەموو ژان و ئازارە چییە؟» هەر خۆشی وەڵامی دەدایەوە: «هەر ئاوایە و هیچ هۆکارێکیشی نییە، تاڵتبێ و خۆشت هەر ئەوەیە.»

لە سەرەتای نەخۆشییەکەیەوە کە بۆ یەکەم‌جار چوو بۆلای دوکتۆر، ژیانی بەو شێوە بوو و جاروبار جێگۆڕکێیان دەکرد:



هێندێ‌جار خەمبار و ناهومێد دەبوو و بیری لە مەرگێکی بێ‌مانا و ترسناک دەکردەوە و هێندێ‌جاریش هیواداربوو گورچیلە و ئاپاندێس و ڕیخۆڵەکانی وەکار بکەونەوە. بەڵام کە دەیدی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ دەردەکەوی کاری‌تر دەبێ هیوای بە گەڕانەوەی تەندرووستی نەدەما و زیاتر بڕوای بە مەرگ دەکرد و هیوابڕاو دەبوو.

لە دوایین ڕۆژەکانی تەنیاییی خۆیدا کە بەرەوڕووی دیوار لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابوو زۆری هەست بە تەنیایی کرد و دڵی بەخۆی سووتا. دیتی لە شارێکی قەرەباڵغ و لە نێو خزمان و ئاشنایان و بنەماڵەکەیدا تەنیایی و بێکەسییەک ڕووی تێکردبوو کە ئەو شێوە تەنیاییە تەنانەت لە قووڵاییی دەریاکان و لە نێو بوودڕ و کەندڕەکانی زەویشدا نەبوو. ئەو تەنیاییە ترسناکە ئیڤانی والێکردبوو لەگەڵ بیرەوەرییەکانی ڕابردوویدا بژی.

وێنەکانی ژیانی ڕابردووی یەک لەدوای یەک دەهاتنەوە بەرچاوی. هەمیشە لە کاتە نزیکەکانەوە دەستی‌پێدەکرد و بۆ دوورترین دەوران واتە سەردەمی منداڵی دەگەڕایەوە و لەوێ ڕادەوەستا. بۆ وێنە کاتێک مرەبای هەڵووچە ڕەشەیان بۆ دێنا بیخوات، هەڵووچە ڕەشەی کاڵ و نەوەکامی فەرەنسیی سەردەمی منداڵیی وەبیر دەهاتەوە و تامی ترشییەکەی دەمی پڕ دەکرد لە ئاو. لەگەڵ ئەو بیرەوەرییانە زنجیرە بیرەوەرییەکی دیکەی وەبیر دەهاتەوە کە لەگەڵ دایەن و براکەی و لەیستوکەکانی ڕاییواردبوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەو بیرکردنەوانە بێ‌کەڵکە و پێویست ناکا، چونکە یەکجار زۆر تاڵ و بەژانە.» هەمیسان دەگەڕایەوە بۆ ئێستا. کە قۆپچەی سەرپشتی

قەنەفەکە و چرچۆلۆچی تیماجەکەی دی دیسان خەیاڵ هەڵیگرت: «تیماجێکی گرانبایییە بەڵام کەمدەوامە، لەسەر ئەوە کێشەیەکمان لێ‌پەیدا بوو.» بیری دوورتر فڕی: «بەڵام تیماجێکی دیکە و کێشەیەکی دیکە ئەو کاتە بوو کە ئێمە جانتا دەستییەکەی باوکمان دڕاند و لەسەر ئەوە لێدانمان خوارد، پاشان دایکم پیراشکیی پێداین.» هەروا لە سەردەمی منداڵیدا مایەوە و دیسان ئەو بیرەوەرییانەی زۆر بەژان بوون و هەوڵی دەدا لە خۆی بتارێنێ و بیر لە شتێکی دیکە بکاتەوە.

هەمیشە لەگەڵ شەپۆلانی ئەم بیرەوەرییانە، لە ڕۆحیدا شەپۆلێکی دیکە ئاخێزی دەکرد و بیرەوەریی بۆ سازدەکرد. بیرەوەریی ئەوەی کە چۆن نەخۆشییەکەی ڕیشەی داکوتا. هەتا لە ئێستا دوور دەکەوتەوە زیاتر هەستی بە ژیان دەکرد. هەم چاکەکانی ژیانی زیاتر بوون و هەم ژیان خۆی، ئەم دووانەش پێکەوە ئاوێتە دەبوون. ئەو بیری دەکردەوە: «هەروەک چۆن ڕەنج و ئازار ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر و قورستر دەبن هەر ئاواش ژیانی تاڵ دیسان تاڵتر تێدەپەڕێ. تەنیا خاڵێکی پڕشنگدار لەوێ لەو دوورانەوە و لە سەرەتای ژیانەوە دەدرەوشێتەوە پاشان هەتا دێ ڕەشتر و ڕەشتر دەبێ و خێراتر و خێراتر دێتە پێشێ. وەک بەردێک کە لە سەرەولێژییەوە خلۆر دەبێتەوە، من خەریکی فڕینم باڵم گرتووە...»

ئیڤان لەرزی، تۆزێ خۆی ئەمبارەوبار کرد، دەیویست خۆڕاگری بکات بەڵام ئەو ئیتر نەیدەتوانی و دەیزانی خۆڕاگری مەحاڵە، بۆیە دیسان چاوی ماندووی لە تیماجی پشتی قەنەفەکەی بڕی و



نەیدەتوانی ئەوەی لەبەر چاویەتی تێی‌نەڕوانێ. چاوەڕێ‌بوو، چاوەڕێی بەربوونەوە،، بەربوونەوە و لەبەریەک بڵاوبوون. چاوەڕوانییەکی تاڵ و ترسناک: «لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئیتر خۆڕاگری مەحاڵە، بەڵام خۆزگە دەمزانی ئەمە چییە؟ ئەم ژان و ئازارانە لەبەر چییە؟ یانی ئەو جۆرەی کە پێویستە ژیاوم یان نا؟ ئەمەش نازانم و مەحاڵە تێی‌بگەم؟»

وەبیر ژیانی ڕاست و دروست و ئابڕوومەندانە کەوتەوە، ژیانێک کە لەودا خۆی لە خۆی ڕازی بێ. «دەستبەردان لەوەش مەحاڵە.»

بزەیەکی تاڵ و تەشەراوی نیشتە سەرلێوی، وەک ئەوەی کەسێکی لەلا بێت. «هیچ ڕوونکردنەوەیەک ناگونجێ و سەرم لێی سووڕماوە! ... ئازاری مەرگ... بۆچی؟ لەبەرچی؟»

**(١١)**

دوو حەوتووی دیکە تێپەڕی و پتریشخۆڤ بە شێوەی فەرمی هات بۆ خوازبێنیی کچەکەیان. ڕۆژی دوایی پراسکۆڤیا چوو بۆ ژوورەکەی ئیڤانئیلیچ و لە بیری ئەوەدابوو کە بە چ شێوەیەک ئەو هەواڵەی پێڕابگەیێنێ. بەڵام بارودۆخی نەخۆشییەکەی ئیڤان گۆڕانێکی تازەی بەسەردا هات و حاڵی زۆرخراپتر بوو. ئیڤان بە شێوەیەکی جیاواز لە ڕۆژان لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابوو، لەپەستا دەیناڵاند و بە شێوەیەکی خەمبار و بێتاقەت چاوی ڕاست لە پێش خۆی بڕیبوو.

پراسکۆڤیا ویستی شتێک بڵێ، بەڵام ئیڤان بە چاوێکی تووڕە و هێندە بە بێزارییەوە تەماشای کرد کە لە ویستەکەی پاشگەز بۆوە و قسەی نەکرد. چونکە ڕوانینەکەی ئیڤان لێوڕێژ بوو لە ڕق و بێزاری لە ژنەکەی.

ئیڤان گوتی:

– بیکە بەخاتری خودا دەستم لە کۆڵ کەوە و لێمگەڕێ با بە دەردی خۆمەوە سەربنێمەوە.

پراسکۆڤیا خەریکبوو لە ژوورەکەی دەچووە دەرێ کە لیزای کچی هاتە ژوورێ و حاڵی باوکی پرسی: ئیڤان بە ساردوسڕی وەڵامی دایەوە:

– خەمت نەبێ زۆر زوو هەمووتان لە دەستم ڕزگارتان دەبێ.



هەردووکیان بێدەنگ بوون و دوای ئەوەی ماوەیەکی کورت لەلای دانیشتن، هەستان و چوونە دەرێ. لیزا بە دایکی گوت:

– ئاخەر خەتای ئێمە چییە؟ خۆ ئێمە نەخۆشمان نەخستووە. من زۆرم خەمی باوکمە و دڵم پێیدەسووتێ، بەڵام ئێمە بڵێین چی؟ بۆ دەبێ ئازاربکێشێ؟

دوکتۆر لە کاتی دیاریکراودا هات. ئیڤان بە «بەڵێ» و «نا» وەڵامی دایەوە و بەردەوام بە ڕق و تووڕەییەوە لێیدەڕوانی و ئاخری گوتی:

– خۆشت دەزانی هیچ کارێکت لەدەست نایە، ئیتر بۆ لە کۆڵم نابییەوە؟ بڕۆ و بە تەنیا بەجێم بێڵە.

دوکتۆر چاوێکی پڕبەزەیی لێکرد و گوتی:

– لانیکەم دەتوانم بە ئازارشکێن ژانەکەت کەم بکەمەوە.

– ئەوەشت لەدەست نایە، تکایە بڕۆ دەستم لەکۆڵ کەوە.

دوکتۆر چوو بۆ ژووری میوانداری و بە پراسکۆڤیای گوت کە زۆر حاڵی خراپە و لە مەترسیدایە، تەنیا ڕێگایەک ماوە ئەویش بەکارهێنانی بەردەوامی تریاکە. ئازاری یەکجار زۆرە و بەڕاستی نازانم چۆن تاقەت دێنێ.

ژان و برکی جەستەی زۆر ترسناک بوو. بەڵام ئازارە ڕۆحییەکەی زۆر لە ئازاری جەستەی بەژانتر بوو، کاتێک دەیدی بنەماڵە و خزم و کەسانی ئاوڕی لێنادەنەوە و کەمتەرخەمن ئەوەندەیتر ئازاری دەکێشا.

شەوێک چاوی لە ڕوخساری خەواڵوو و دڵۆڤانی گراسیم کرد و لە ناکاو ئەم پرسیارە لە زەینیدا سەری هەڵدا: «بڵێی بەڕاستی هەموو ژیانم هەڵە بووبێ؟ بڵێی کاروباری ئیداریم و پێوەندی لەگەڵ بنەماڵە و تەواوی ئەرکە کۆمەڵایەتی و ئیدارییەکانم بێهوودە بووبێتن؟» هەوڵیدا بەرەڤانی لە ڕابردووی بکات، بەڵام هیچ کەرەسەیەکی بۆ ئەو بەرەڤانییە پێشک نەدەهات.

لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «بەڵام ئەگەر وابووبێ، ئیتر هیچ هەلێک بۆ چاککردنی نەماوە و هیچم لەدەست نایە.»

لەسەر شان ڕاکشا و بە ڕوانگەیەکی تازەوە بە ژیانی خۆیدا هاتەوە. بۆ بەیانی لە ئاکار و هەڵسووکەوتی دەوروبەرییەکاندا بە ئاشکرا بۆی دەرکەوت کە لە ژیانیدا و ئەوەی بۆی ژیاوە، بە هیچ شێوەیەک ڕاستەقینە بوونی نەبووە، هەر ئەو ئاگاداربوونەش ژانی جەستەی ئەوی دە بەرانبەر قورستر کرد. لە ناخی سینگییەوە ناڵاندی و تلێکیدا و کەوتە سەرشانەکەی‌تری.

ڕادەیەکی زۆریان مۆرفین پێدا و بێهۆش کەوت. لای نیوەڕۆ ئەو و ژان و برکی تاقەتپڕووکێن پێکەوە خەبەریان بۆوە.

ژنەکەی هات بۆلای و پێی‌گوت:

– خۆشەویستەکەم، جینگیان! ئەم کارە لەبەر خاتری من بکە. ئەم کارە هیچ زیانێکی نییە و یارمەتیشت دەدا تەنانەت کەسانی ساغ و تەندرووستیش ئەو کارە دەکەن.

ئیڤان کە زۆری ڕق هەستابوو چاوی زەق کردەوە و بە تووڕەیی گوتی:



– ئەوە دەڵێی چی؟ من چ کارێک دەتوانم...؟

– لەگەڵ قەشە قسە بکە.

– بۆ قسەی لەگەڵ بکەم؟ پێویست ناکا! بەڵام وادیارە... دەبێ ئەو کارە بکەم، وانییە؟

پراسکۆڤیا دەستدەکا بە گریان:

– بەڵێ خۆشەویستەکەم، واباشە ئەو کارە بکەی. ئەوا دەنێرم بە دوای جەنابی قەشەدا، ئەو زۆر پیاوێکی باش و ڕۆحسووکە.

ئیڤانئیلیچ لە ژێر لێوەوە شتێکی گوت:

دوای هاتنی قەشە و ددانپیانان، ئیڤان هێندێک هێور بۆوە و هەستی‌کرد لە هەموو ترس و دوودڵی و ئازارەکانی ڕزگاری بووە و بۆ چەند ساتێک تیشکی هیوا ڕووناکیی بە دنیای ڕەش و تاریکی بەخشی. بەڵام دوای تاوێک دیسان کەوتەوە بیری گورچیلە و ڕیخۆڵەکوێرە و گریمانەی چاکبوونەوە و وەکارکەوتنەوەیان. پاشان بڕوایەکی تایبەت و ڕۆحانی گیانی داگرت و بێئیختیار فرمێسک بە چاوانیدا هاتە خوارێ.

دوای ددانپیانان کاتێک لەسەر تەخت ڕایانکێشا، بۆ خولەکێک هێمنایەتی و هێوربوونەوەیەک سەرتاپای داگرت و بۆ جارێکی‌تر هیوا بە ژیان لە مێشکیدا ژیاوە. بیری لەو نەشتەرگەرییە کردەوە کە پێیان پێشنیار کردبوو و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ژیان! ئەرێ دەمەوێ بژیم.»

پراسکۆڤیا دوای قسەی هەمیشەیی پرسیی:

– حاڵت چۆنە، باشتری خۆ؟ وادیارە شوکر باشی.

بەبێ ئەوەی چاوی لێبکا وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ.

ئاکار و هەڵسووکەوتی ژنەکەی کە کاردانەوەی ئاکارە دەروونییەکانی خۆی بوو، نیشاندەری هەقیقەتێک بوو: «هەموو ئەو شتانەی کە بۆی ژیاوی و ئێستاش بۆی دەژیی درۆ و خۆهەڵخەڵەتاندنە، فێڵێکە کە مەرگ و ژیان لە تۆ دەشارێتەوە.» هەر لەگەڵ ئەو بیرکردنەوەیە، گڕی ڕق و قینی لە ناخیدا هەڵگیرساند و لەگەڵ ئەویشدا ژان و برکەکەی هەناوی جارێکیتر هەڵەسوونی هێنایەوە کە هاوڕێبوو لەگەڵ هەستێکی تازەی گەیشتن بە ئاکامێکی حاشالێنەکراو بۆیە کەوتە دڵەکوتێ و هەناسەی سواربوو. حاڵەتی ڕوخساری کاتێک چاوی لە ژنەکەی کرد و گوتی بەڵێ، زۆر ترسناک بوو. هەر خێراش گوڕاندی:

- بڕۆ دەرێ! بڕۆ دەرێ و دەستم لەکۆڵ کەوە.



## (١٢)

دوای ئەوە هاوار و ناڵەی تاقەتبڕ و پڕئازار بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بوو؛ ناڵە و هاواری لە تەواوی ماڵەکەدا دەنگی دەدایەوە. لەو کاتەوە کە ژنەکەی لە ژوورەکەی خۆی دەرکرد بۆی دەرکەوت کە مردنی یەکجارییە، تازە چاکبوونەوە و گەڕانەوە خەیاڵی خاوە و واچاکە دەست لە هەموو هیواکانی بەردا، چونکە دەیزانی نامێنێ و تەواو دەستی لە خۆی بەردابوو. بە شێوەی جۆراوجۆر هاواری دەکرد و هێندێ لە پیت و واژەکانی بە لەبزێکی تایبەت دەردەبڕی.

ـ وەییی، ئایییی،» کالیکەی بە توندی بە سەر یەکدا دەنا و گوشاری بۆ شەویلاکەی خۆی دێنا. هەستی دەکرد خەریکن سەرەوخوار دەیخەنە نێو چاڵێکی تاریکەوە و سات بە سات چاوەڕێ بوو پاڵێکی پێوەنێن و بکەوێتە قوڕگی بێبن و ئەنگوستە چاوی ئەو چاڵەوە. سێ ڕۆژی تەواو لە هەمبەر ئەو هێزە نادیارەدا خۆڕاگریی کرد کە دەیویست فڕێی بداتە نێو چاڵەکەوە. ڕاست وەکوو مەحکووم بە مەرگێک کە بە دەست جەللادەوە خۆی ڕادەپسکێنێ و لێشی ڕوونە ئەو هەوڵ و خۆڕاپسکاندنە بێهوودەیە. سات لە دوای سات لەو شتە تۆقێنەر و بەسامە نزیک و نزیکتر دەبۆوە. ئەو هەستی دەکرد کە ئازارەکەی ئەوەیە بکەوێتە نێو ئەو کونە تاریکەوە و بەڵام هەروا بە هەڵواسراوی مابۆوە و نە ئەوەبوو تێکەوێ و نە ئەوەبوو ڕزگاری ببێ. لەلایەکیشەوە بیری دەکردەوە ڕەنگە ژیانی باش و بەکەڵک بووبێ بۆیە تێناکەوێ. ئەم فحێڵکردنەی ژیانی ئەوی زنجیر دەکرد و

نەیدەهێشت بە سەرەوە تێکەوێ، لە هەمووشی زیاتر ئەوەبوو ئازاری دەدا.

لە ناکاو زەبرێکیان لەسەر سینگ و قەبرغەی کوتا و ئەوەندەی دیکە هەناسەی توند بوو و سەرەوبن کەوتە نێو کونە تاریکەکەوە. لەوسەری چاڵەکەوە ڕووناکییەک دەرکەوت، وەک کەسێک کە سواری شەمەندەفەرێک دەبێ و هێندێجار پێیوایە شەمەندەفەرەکە بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، ئەگەرچی لە ڕاستیدا بۆ پێشەوە دەڕوا و ئەو ڕۆیشتنی ڕاستەقینەی شەمەندەفەرەکەی لێ تێکچووە. ئیڤانئیلیچیش تووشی باردودۆخێکی ئاوا بووبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەموو ئەوانە ئەو جۆرەی کە دەبێ ببێ نەبوو، بەڵام ئەوە گرینگ نییە. وێدەچێ بکرێ (ئەوە) ئەنجام دەم.» لە ناکاو لە خۆی پرسی: «(ئەوە) یانیچی؟ کتوپڕیش ئارام بۆوە.

ڕۆژی سێهەم دوو سەعات بەر لە مردنی ئەم فکر و خەیاڵە تێکەڵ پێکەڵانە مێشکی بە خۆیەوە خەریک کردبوو. ئیڤان سەرقاڵی هەڵسەنگاندنی ئاکارە باش و خراپەکانی خۆی بوو، هەستی کرد کەسێک دەستی دەگرێ. بەڵێ، کوڕە قوتابییەکەی بوو دەستی باوکی گرت و نای بە لێویەوە و گریانێکی بەکوڵ و دڵهەژێن لە گەرووی تەقییەوە و لەوانەبوو سەری بە هەنیسکەوە هەڵقەندرێ. هەر لەوکاتەدا هاوسەرەکەی هاتە ژوورێ و لەبەر سەرسووڕمان زاری داچەقا و فرمێسک بە لالووت و چەناگەیدا هاتە خوارێ و بە شێوەیەکی هیوابڕاوانە چاوی تێبڕی. ئیڤان بە دڵ خەمی ئەوانی بوو: «ئەرێ زۆرم تووشی دەردەسەری کردن. هەموویان خەمبارن، بەڵام



بمرم بارودۆخەکە باشتر دەبێ.» حەزی دەکرد ئەو قسانە بکات، بەڵام توانای قسەکردنی نەبوو و زمانی شکابوو. بیری کردەوە: «بەڵام بۆ دەبێ بە زمان بیدرکێنم؟ دەبێ عەمەلی پێبکەم.» بە ئاماژە هاوسەرەکەی حاڵی کرد کە ڤلۆدیا بنێرێتە دەرێ. زۆر بە زەحمەت گوتی:

– زۆرم خەمی ئەوە... بۆ تۆش زۆر بە پەرۆشم... ـ هەولێدا بڵێ: «لێمببوورە» بەڵام گوتی:

– بیبە دەرێ.

دەیزانی ئەوکەسەی کە بیهەوێ تێبگا، تێدەگا. بۆیە دەبوو کارێک بکات کە زیاتر لەوە دەورووبەرییەکان ئازار نەدات. ئیڤان لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ هەموو شتەکان ڕاست و دروست نەبوون، بەڵام گرینگ نییە، دەکرێ باش ببێ.» هەورەها لە خۆی پرسی: «بەڵام ڕاست و دروست چییە؟» هەر لە ناکاویش بێدەنگ بوو.

هەستی کرد تەواوی ڕەنج و ئازارەکەی لەبەر ئەوەیە حەز ناکا بچێتە نێو کونە تاریکەکەوە. دەترسا و لە هۆیەکەی نەدەگەیشت. لە ناکاو زەبرێکی توندتر لە پێشوو لە سێنگ و لاکەلەکەی درا. بە جۆرێک کە بۆ ساتێک هەناسەی لە سینگیدا ڕاوەستا و هەتا ماوەیەک نەیتوانی هەناسە بکێشێ. جگە لەو وزە پڕگوشارەی بە ئاشکرا خۆی لە ناخ و سییەکانی توند کردبوو و بەری نەدەدا، هێزێکی‌تریش گرتبووی و نەیدەهێشت بکەوێتە نێو کونە تاریکەکەوە. بەڵام کتوپڕ ئەو هێزەی دووهەم کەم بۆوە و بە پرتاو کەوتە نێو قووڵک یان کیسەکەوە: «چەندە باش و چەندەش بە ئاسانی.» لە بنی کیسەکەوە

شەبەقێکی دەدی. هەوڵیدا گوشار بۆ مێشکی خۆی بێنێ و فکرەکانی کۆ بکاتەوە. «ئازارەکە لەکوێیە؟»

«بەڵێ، ئەوەتا لێرەیە.»

«مەرگ؟ ترس؟»

«ترسی چی؟ کوا ترس؟ کامە مەرگ؟» ترسێک لەگۆڕێدا نەبوو، چونکە هیچ مەرگێک بوونی نەبوو.

بەجێی مەرگ ڕووناکی هەبوو.

لەناکاو بە دەنگێکی بەرز گوتی:

– کەوایە ئاکامەکەی ئەوەیە! چ چێژێک، ئۆقرەگرتن!

هەموو ئەو ڕووداوانە لە ساتێکدا قەوما و بۆ دەوروبەرییەکان دوو سەعاتی دیکەی خایاند. شتێک لە گەروویدا دەنگی هات، لەشە کەلەلاکەی تەکانێکی خوارد، پاشان کەوتە هەناسەبڕکێ و دەنگەکە لە گەروویدا کەم بۆوە و دووپات بوونەوەکەشی کەمتر بۆوە.

کەسێک کە لە نزیکی ڕاوەستابوو گوتی:

– تەواو بوو.

ئیڤان بیستی و ئەوەی لە زەینی خۆیدا دووپات کردەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «مەرگ تەواو بوو و ئیتر نابێ و بوونی نییە!»

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و هێشتا بە تەواوی هەناسەی دەرنەدابۆوە پشووی ڕاوەستا. لەشی شەکەت و کەلەلای کێشایەوە و جووڵەی لێبڕا و مرد.



## فەرهەنگۆک

**ئاخێز**: سەرهەڵدان، ڕاسان، هەستان

**ئاریشە**: کێشە، گرفت

**ئێزنگ**: سووتەمەنی، کۆلکەدار بۆ سووتاندن

**ئەوق**: نوقم، غەرق

**باویلکە**: پەپوولەپایزە، پشیلۆکە، پشیلەپایزە

**بوودڕ**: قووڵک و کەندڕی قووڵ کە ڕووناکایی لێی نادا

**بۆسە**: ڕەبەت، کەمین

**بیچم**: شێوە، ئەدگار، ڕواڵەت

**بە پێی فیلان**: بریتی لە زۆر و زەوەندە

**بەرەڤانی**: بەرگری، دیفاع

**پاپەزێن**: پارییەکە بە وەرەق دەکرێ. پەڕێن

**پلوورە**: کەندووی مێشەنگوین

**پێمل بوون**: ڕازی بوون لە ڕووی ناچارییەوە

**پەترۆ**: قەتماخە، قرماخە. خوێنی وشکەڵاتووی سەر برین

**پەرجۆ**: مۆجیزە (معجزە)

**پەنیجە**: پەیژە، نێردیوان، پاینجە

**تامڵ کردن**: تاقەت هێنان، بەرگە گرتن

**تیفتیفە**: بریتی لە تاشین و زۆر چاک لووس کردنی ڕیش

**تیماج**: قایشی نەرم و لووس بۆ باڵتە و قەنەفە و کڵاو

**تەنەوە کردن**: پەرە گرتن، تەنینەوە بە تایبەت بۆ نەخۆشی

**جامەلووسکێ**: ڕیایی، مەرایی، ماستاوچییەتی، تەشیڕێسی

**جینگنۆکە**: شەڕانی و بە پرتەوبۆڵە، کەمتاقەت و تووڕە و ئاڵەتی

**چپڕ**: چڕوپڕ، لێڕەواری زۆر چڕ

**چنۆک**: چکووس، ڕژد، سەقیل، ڕەزیل، جەبوون

**خۆماک**: غەریزی، بە شێوەی خۆماک، بە شێوەی غەریزی

**دۆلکە**: سەتڵی چکۆڵەی ئاو، تۆنگە

**دیلمانج**: وەرگێڕ

**ڕاچێت**: نوسخەی دوکتۆر کە دەوا و دەرمانی تێدا دەنووسێ

**سندم**: کۆت و زنجیری پێی دیل و زیندانی

**شوو لێهەڵکێشان**: بریتی لە بێحەیایی و سەرەڕۆیی لە ڕادە بەدەر

**شەرزە**: بریندار و کوتراو، کۆڵەوار

**شەڵغە**: پوورە، تێکهاڵانی هەنگ بە چڵەدار و گیایەکەوە

**فحێڵ**: لە تاوان شۆرانەوە، بێبەری بوون لە تاوان (تبرئە)

**قورساخ**: ویقار، سەنگینی

**کسکە**: بریقەی چاوی پشیلە و ڕێوی و.. لە شەودا

**کلکەسووتێ**: بریتی لە ماستاوچییەتی، تەشیڕێسی، مەرایی

**کندێلە**: کەنەف، گیایەکە بۆ بەن و جلوبەرگ دەبێ

**کوتوپچڕ**: قسە کردن بە شڵەژاوی و زمان تێکەڵهاتنەوە

**کۆزیلکە بەستن**: کۆ بوونەوە لە دەوری یەک، سەر پێکەوەنانی چەند کەس پێکەوە.

**کەمجیکەڵدانە**: بریتی لە کەمتاقەت و ئاڵەتی

**گت گرتن**: تۆزە ڕاوەستان لە قسەکردندا (مکث)



**گولدوزام**: شڵی و پەڵەی سەر پێست کە زیاتر بە کەسانی سپی و کاڵوکرچەوە دەبیندرێ

**گوێقوڵاخ**: زیت و وریا و لەسەر هەست

گەڕەلاوێژ: بە نۆرە گۆرانی گوتن لە کۆڕێکدا

**لاتراسکە** بەستن: سەرەنگرێ بوون

**ماریجە**: چارەسەر، (معالجە)

**مامزە**: قیتکەیەکی تیژە بە پشتی جزمە و پۆستاڵەوە سوار بۆ لێخوڕینی یەکسم لە بەر زگ و لاتەڕافی دەکوتێ

**نقشک**: سەرتوێی شیر، خامە

ودم: ئیجازە، مۆڵەت

**هەڵمەقووت**: قووتدان بە گورجی و خێرایی

**هەڵەسوون**: شین بوونەوە، سەرهەڵدانەوە

**هەڵەنگووتن**: سەرسمدان، هەڵکەوتن

**هەمار**: عەمبار، ئەمبار

**یەکهاوێ**: یەکڕەواڵ (یکنواخت)

## بەرهەمی بڵاوكراوەی وەرگێڕ:

١. تاپۆی وەرزێکی سەوز، شیعر، ١٩٩٧

٢. شەوەژانی ئەستێرەیەک، شیعر، ٢٠٠٠

٣. مەرگەخەون، شیعر، ٢٠٠٣

٤ــ دیـسان لــەو شــەقامانــەوە، کـۆچیرۆکی بیــژەن نــەجـدی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٥. تەپڵی ئاور، کۆچیرۆکی بیانی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٦. جێگەی بەتاڵی سلووچ، ڕۆمان، مەحموود دەوڵەتئابادی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٦

٧. خۆر و لاولاو، کۆشیعری منداڵان، ٢٠٠٧

٨. برایانی کارامازۆف، ڕۆمانی داستایۆڤسکی، وەرگێڕان ٢٠٠٧

٩. یەکگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٧

١٠. خولیای نووسین، ڕەزا بەراهەنی، کۆمەڵەوتار، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٨

١١. فەرهەنگی ڕێژگە (ئەو وشانەی لە هەمبانەبۆرینەدا نین)، ٢٠٠٩

١٢. کەڵەشێری ورگن، گێڕانەوەی چیرۆکێکی فۆلکلۆر، ٢٠١٠

١٣ــ تازیــەبــارانی بــەیــەل، ڕۆمــان، غــولامحوســێن ســاعیدی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

١٤. ئاناکارنینا، ڕۆمان، لیۆن تۆلستۆی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠



## ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:

١. نارنجیفڕین، کۆچیرۆک

٢. دار و پەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەڕ، وەرگێڕدراو

٣. سترانی شەپۆلەکان، شیعری هاوچەرخی فارسی، وەرگێڕدراو

4– ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆچیرۆک، وەرگێڕدراو

٥. ئەرباب و نۆکەر، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

٦. باوە سیرگی، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. دیلی قەفقاز، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. مەرگی ئیڤان ئیلیچ، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

. ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شێعر

. زایەڵەی شاخ و قیژەی گوڵەباخ، کۆمەڵە شێعر

. هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شێعر

**سەرچاوە:** مرگ ایوان ایلیچ، لیو تولستوی، ترجمەی شروش حبیبی، چاپ اول، پاییز تهران نشر چشمە